ئاستانه



# ئێستا کامان قورئانیین؟!

نووسینی: ڕاشد ئیکڕام

# پێشەکی

پاش سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە و پەروەرێنی جیهانیان، درود و سەلامیش بۆ پێغەمبەر (ﷺ) و تەواوی هاوەڵان، دوعای هیدایەت و خێریش بۆ موسڵمانان، وە داوای بەرەکەت و میهری خودا بۆ ئەم نووسینە و خوای گەورە بیکاتە هیدایەت و ڕێنوێنی بۆ تەواوی خوێنەرانی. لەلای خوێنەر ڕوونە کە قورئانییەکان کێن و چەند گرۆن، هەروەها شێوازی مامەڵەیان لەگەڵ فەرموودەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) چۆنە. ئەم گرۆیەش جیا لە زۆرینەی گرۆکانی تر، سەنگەریان گرتووە لە دژی سوننەت و لە هەموو جێیەک دژایەتی فەرموودە دەکەن.

لەو سۆنگەیەشەوە بە پێویستم زانی لە سەنگەری خۆمەوە بەرگریەک بکەم و وەڵامێکی کورت و پوخت ئامادە بکەم، وەک زانایان دەفەرموون (کەم زۆرترە لەهیچ). پێم وایە ئەم شێوازی نووسینە کە زۆر کەم دەیبینم لەنێو کتێبە چاپکراوەکاندا بەتایبەتی کتێبخانەی کوردی، کە هاتووین بە چیرۆک و شێوازی گفتوگۆیەکی زانستی چارەسەری هەندێک کێشە فیکری و زیهنییەکان دەکەین، و لە ڕێی ئەم چیرۆکەوە خوێنەرمان وا لێکردووە کە کەمترین پرسیار نەمێنێت کە جوابی لە نووسینەکەدا وەچنگ نەکەوتبێت.

هەروەها لە خوێنەری بەڕێزی نەشارمەوە لەم چیرۆکەدا هەردوو کارەکتەری (ماجید) و (عەزیز) دوو کارەکتەری دروستکراون، بەڵام بەس وێنایان لە کۆمەڵگەی ئێمەدا هەیە، کارەکتەری (ماجید) وەک قورئانییەک دەیەوێت بیسەلمێنێت کە فەرموودەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەحییە و سەرچاوەیەکە لە سەرچاوەکانی یاسا دانان، (عەزیز)یش وەک قورئانییەک

دەیەوێت بیسەلمێنێت کە قورئان سەرچاوەی وەحییە و پێوەری ڕاست و دروستی فەرموودەیە و فەرموودەش هیچکات نابێتە سەرچاوەی یاسادانان، ئێمەش وەک خوێنەری ئەم چیرۆکە تەماشا دەکەین بزانین عەزیز قورئانییە یاخود ماجید؟ پێکەوە دەچینە خزمەت چیرۆکەکە.

**نووسەر**

# تەوەری یەکەم

## سەرەتا و دەستپێکی چیرۆک

دەچینە شاری هەڵەبجە و لەوێ دەچینە خزمەت ماڵێکی فەقیر کە کوڕێک تێیدا دەژی بەناوی (ماجید) ئەم ماجیدە گەنجێکی خوێنەوار و خوێنەر دەبێت، لە خزمەت مامۆستایانی ئایینی و حوجرەکان جیا لە خوێندنەکەی خۆی کە (یاسا) دەخوێنێت وانە فیقهی و ئسوڵییەکانیش دەخوێنێت، لەو شارە بچووکەی کە ماجید تێیدا دەژیا بەردەوام کۆڕ و سیمینار و بابەتی جیاجیا دەوروژێنرا، ماجید بەردەوام حەزی بەو دانیشتن و کۆڕانە هەبوو بەشداریشی تێدا دەکرد.

جارێک لە جاران دەچێتە کۆڕێک کە بۆ مامۆستایەکی بەڕێز بەسترابوو کە لە شاری هەولێرەوە هاتبوو کە باسی پێوەربوونی قورئانی دەکرد، مامۆستایەکی شەرمن و لەسەرخۆ بوو، بابەتێکی زانستی قووڵی باسکرد، لەکاتێک کە نزیک بووبوویەوە لە تەواوکردنی بابەتەکەی کات دانرا بۆ بەشداربووان، بەشداربوویەک هەستایەوە بەناوی (عەزیز) تێکڕای قسەکانی مامۆستای ڕەفزکرد و کۆمەڵێک قسەی کرد کە زۆرێک لە ئامادەبووانی تووشی شۆک کرد، قسەکانی لای ئامادەبووانی کۆڕەکە ئەوەندە تازەبوو نەیانبیستبوو، ماجیدیش وەک حەزی بەردەوامی خۆی دەچوو بە شوێن قسەی تازە و بەردەوام دەیویست زانیاری نوێی پێ بێت، پاش هەندێک گفتوگۆ و وەڵامدانەوە (عەزیز) کۆڕەکەی لەبەرژەوەندی قسەکانی خۆی تەواوکرد، ماجیدیش وابەستەی قسەکانی (عەزیز) بوو، ماوەیەکی باش خوێندنەوەی لەسەر ئەو قسانەکرد، (ماجید) تەنیا هەوڵی تێگەیشتن بوو،

بۆیە (عەزیز) لەهەر شوێنێک دەربکەوتایە و قسەی هەبوایە (ماجید) لەوێ دەبوو، تا وایلێهات ماجید باوەڕی بە فەرموودە لەق بووبوو.

ڕۆژ هات و ڕۆژ ڕۆیشت، ماجید بووە پارێزەر و عەزیزیش بووە یەکێک لە پیاوە ئایینیەکانی هەڵەبجە و لیژنەی فتوا و مامۆستایان بە گوێی ئەویان دەکرد، عەزیز بووە کارەکتەری دینی زۆر بەهێز، ماجیدیش هەر لە خوێندنەوە و شیتەڵکردنی قسەکانی عەزیزدا دەتلایەوە، پاش ئەوە ماوەیەکی زۆر ماجید خۆی لە هاوەڵان و هاوفیکرانی دابڕی و دەستی دایە تەنیایی بۆ ڕێکخستنەوەی هەموو ئەو زانیاریانەی لە مێشکی دایە و بەستنەوەی هەموو ئەو بیردۆزانەی کە زانیاری لەسەری هەن بە قورئانی پیرۆزەوە، بەجۆرێک کە قورئانی کردە پێوەر بۆ هەموو شتێک، بۆی دەرکەوت ئەوەی عەزیز پێشتر دەیووت کە قورئان با پێوەربێت بۆ هەموو شتێک و بەتایبەتی فەرموودە، ئەوە خودی عەزیز قورئانی نەکردووەتە پێوەر و بە پێوەرەکانی خودی عەزیز (عەزیز) قورئانی نییە، بۆیە ماجید پاش تێرامانی دوو ساڵ و شەنوکەوی هەموو ئەوەی بیری لێدەکردەوە و بەستنەوەی هەموو بیردۆزەکانی بە قورئان، دووبارە هاتەوە نێو کۆمەڵگە و وابەستەی کۆڕ و سیمینارەکان بوویەوە.

بینی ئێستا لە بڕی ئەوەی عەزیز وەک ئامادەبوویەکی کۆڕ قسە بکات و بابەت بوروژێنێت. ئێستا عەزیز خۆی کۆڕی بۆ سازدەکرێت، لە کۆڕێکیدا ماجید بەهەندی دەگرێت کە بچێت و بزانێت چی دەڵێت، بۆیە هەر پێش چوونەکەی بڕیار دەدات وەڵامی بداتەوە، دەچێتە کۆڕێکی عەزیز بەناوی مەبادئ و مەڕویات و، تێیدا عەزیز قسەی دەکرد و، سەرەتا و کۆتایی بابەتەکانی باسی ئەوە بوو کە ئەگەر قورئان پێوەربێت فەرموودە جێی نابێتەوە لە ژیانی ڕۆژانەمان، وە قورئان هەموو شتێکی باسکردووە و چی و چی، ئەمە ماجید قەڵس دەکات، چونکە لای وایە کە قورئان پێچەوانەی

ئەو قسانە دەفەرمووێت، بۆیە دەست بڵند دەکات و دەڵێت هەموو ئەو قسانەی تۆ دەیکەیت پێچەوانەی قورئانە، گفتوگۆیەکی بچووک دەکەوێتە نێوانیان و کۆمەڵێک قسە دەکرێت.

گوێی ئامادەبووان کۆمەڵێک قسەی تازەی پێدا دەڕوات کە پێشتر نەیانبیستووە، بۆیە کۆتایی بە کۆڕ و سیمینارەکە دەهێنن و ماجیدیش داوای دیبەیت و کۆڕێک لە ڕێکخەرانی کۆڕەکە دەکات، پێکەوە هەمووومان چاوەڕوانی ڕێکخستنی دیبەیتەکە دەکەین.

## تەوەری دووەم
## داوای بەستنی دیبەیت لەنێوان عەزیز و ماجید

ڕێکخراوی (کۆردینەیت) هاتە نێوان عەزیز و ماجید داوای لە هەردووکیان کرد کە دیبەیتێکیان بۆ سازدەکات و عەزیز لەوەڵامی (کۆردینەیت) وتی کە ماجید منالی دوێنێیە و من دیبەیتی لەگەڵدا ساز ناکەم، ئامادەش نیم ئەوەی پێمە لە بیرۆکە بیخەمە پێش منداڵێک بۆم شیتەڵ بکات.

بۆیە ماجید لە وەڵامی ئەو قسەیەی عەزیزدا وتی جیاوازی تەمەنمان تەنیا چەند ساڵێکی کەممە و منیش ئێستا خاوەنی ماڵ و منداڵم، کاک عەزیز ڕاست دەکات ئەگەر بابەت کڕینی مەڕ و ماڵات و ئاژەڵدارییە ئەوە پێویستی بە تەمەن هەیە و دەبێت خیبرەت زیاتر بێت، بەس ئەم بابەتە بابەتێکی زانستییە و کاک عەزیز دیبلۆمی هەیە و منیش دکتۆرام هەیە و دەبێت ناوەندێکی ئەکادیمیش دیاری بکات کاممان توانستی زانستیمان زیاترە لەوی دیکە، بۆیە تەمەن پێوەر نییە لەم بابەتانەدا، هیوام وایە ئەو بەڕێزە دابنیشێت لەگەڵماندا و پێکەوە شەن و کەوی ئەو بابەتە بکەین، ڕێکخراوی کوردینەیت پاش ئەوەی هەوڵێکی زۆریدا و بێ ئەنجام بوو نەیتوانی دیبەیتەکە ڕێکبخات.

ماجید زۆر هەوڵیدا لەگەڵی دابنیشێت، بەڵام بێ هوودە بوو، بۆیە بڕیاریدا کە لەهەر شوێنێک (عەزیز) کۆڕ و سیمینار بکات ئەم بەشداری بکات و وەڵامی زۆرینەی ئەو بابەتانە بداتەوە کە عەزیز دەیوروژێنێت، عەزیز تەماشای کرد کۆڕ و سیمینارەکان لەبڕی ناساندنی بوونەتە هۆی لەقبوونی متمانەی خوێندکاران و هەوادارانی، چونکە هیچ سیمینارێک

نییە ماجید نەیەت و لێی تێکنەدات.

بۆیە بەناچاری و نابەدڵی بڕیاری سازدانی سیمینارێکی لەگەڵدا دەدات و دەڵێت: «ئامادەم لەگەڵ ئەو توندڕەوە ئاست نزمەدا دابنیشم و دیبەیتێکی لەگەڵدا ساز بدەم، بەڵام ئەوەی لەوێیە دەبێت تەنیا بە بانگهێشت نامە بانگبکرێت، و نابێت هیچ کەسێکی تێدابێت کە بانگهێشت نەکرابێت، لای منەوە تەنیا دە کەس بانگ دەکەم و ماجیدیش دەبێت دە کەس بانگ بکات»، داینابوو دە خوێندکار و هەواداری زۆر دڵسۆزی خۆی بانگ بکات.

ماجید بە هەموو مەرجەکانی عەزیز ڕازی بوو، خۆی ئامادەکرد کە ڕۆژی چوارشەممە واتە پاش دوو ڕۆژی دیکە دانیشتنەکە ئەنجام بدەن، ماجید تەنیا چوار کەسی لەگەڵ خۆی بردبوو کە چوار هاوڕێی خۆی بوون کە وابەستەی بیرۆکەکانی عەزیز بووبوون، کە چووە ناو هۆڵەکە دەبینێت هەموو ئەوەی لەناوهۆڵەکەدان دۆستانی عەزیزن و تەنیا و تەنیا لەنێو ئەو ژمارە کەسە دایە، کە سەداسەد بیریان پێچەوانەی یەکدییە، ماجید چووە سەر مێزی گفتوگۆ و عەزیز نەهاتبوو، پێش ئەوەی بگات ئامادەبووان بە دەنگی بەرز وەک ئەوەی بڵێیت پلانیان دانابوو کە هەندێک قسە بدرێت بە گوێیدا تا ڕەتی قسەکانی لێتێک بدەن، یەکێک دەیووت ئەم مناڵە چییە کاک عەزیز لەگەڵی دادەنیشێت، یەکێکی تر دەیووت ئەمە خۆی پێشتر لای عەزیز دەرسی دەخوێند و بەردەوام لە کۆڕ و سیمینارەکانی ئەوا دادەنیشت، یەکێکی تر دەیووت هەر بە یەک، دوو ئایەت ئەم داماوە لول ئەکات و چی و چی ...

ئەم قسانە دەکرا و عەزیز خۆی و چەند کامێرەوانێک و زیاتر لە دە خوێندکاری هاتنە نێو هۆڵەکە و خوێندکارێکی خێرا چووە سەر مێزی گفتوگۆکە و کورسی و مایکەکانی بۆ ڕێکخست و عەزیز دەستی تەواوی

ئامادەبووانی هۆڵەکەی گوشی و سڵاوێکی ساردیشی لە ماجید کرد، ماجید بەو قسانە و بەو ڕەفتارانە زۆر بێتاقەت بوو، بەجۆرێک کە لە دوورەوە هەست دەکرا بە قەلەقی و بیزاری ماجید، چونکە ئەزموونی دیبەیت و سەرمێزی گفتوگۆی نەبوو، سەرەڕای ئەوەش ئەو کەسەی دانرابوو بۆ ئیدارەدانی گفتوگۆکە بەرپرسی لیژنەی فتوا بوو، بەناوی (مەلا موحەممەد) کە کەسێکی نزیک و هاوبیری عەزیز بوو، ئەوە زۆر زیاتر ماجیدی دوودڵ کردبوو.

پاش هەموو ئەمانە مەلا موحەممەد پێشەکییەکی دوور و درێژی لەسەر بیروڕای هەردوولا باسکرد و زۆر میانڕەوانە بابەتەکەی وروژاند، بەجۆرێک هەر بەو سەرەتایەی مەلا موحەممەد (ماجید) ئاهێک بە دڵیدا هاتەوە و زانی کە کەسانێک لەهۆڵەکەدا کە وابەستەی ڕاستی بن و بۆ شکاندنی ئەم نەهاتوون، چونکە ئەو پێشتر وەها وێنای هۆڵەکەی کرد، کە تەنیا دەرچەیەک نییە و نەماوە کە هەناسەی تێدا بدات، بۆیە زۆر ئارام بوویەوە و هۆشی دایە قسەکانی مەلا موحەممەد، دواتر دەستی کردە ناساندنی ماجید و عەزیز و هەریەکەیانی بەپێی پێویست ناساند، مەلا موحەممەدیش خۆی لەوە بوارد لە باسی ئاستی زانستی هەردوولا باس بکات و هەردووکیانی بەبێ ناونیشانی زانستی ناساند. پاشان دەستی کردە پرسیار کە لە تەوەری سێیەمدا باسی لێوە دەکەین.

## تەوەری سێیەم

## دەستپێک، مەلا موحەممەد ماجید دەدوێنێت

مەلا موحەممەد: بەڕێزان سەرەتا من هەندێک پرسیار لە کاک ماجید دەکەم و کاتی تەواو دەدەم پێی جوابی پرسیارەکان بداتەوە و دەشتوانێت لەنێو کاتەکەی خۆیدا مەجال بداتە کاک عەزیز وەڵامی پرسیارەکان لەو وەرگرێت، بۆیە سەرەتا پێم خۆشە ئەم پرسیارە یەکلایی بکەینەوە کە ئایا غەیری قورئان سروش (وحی) بۆ پێغەمبەر (ﷺ) هاتووە؟

ماجید: مەلا موحەممەد من سەرەتا پێم خۆشە پێش ئەوەی بچینە نێو ئەو پرسیارانەوە یەک دوو شت یەکلایی بکەینەوە، بۆ ئەوەی دیبەیتەکە سەرکەوتوو بێت، دەبێت کۆمەڵێک یاسا و ڕێسا دابنێین لەنێوان خۆماندا جیا لەو ڕێسا و یاسایانەی تۆ باست کرد.

مەلا موحەممەد: بۆ نموونە چ ڕێسایەک؟

ماجید: خاڵی کۆکەرەوەی نێوان من و کاک عەزیز قورئانە و دەبێت قورئان پێوەری نێوانمان بێت و بەهیچ جۆرێک تا سەریحی قورئان هەبێت پەنا نەبەینە بەردەم تەفسیر و تەئویل.

عەزیز: ئەو خاڵەم زۆر بە دڵە.

مەلا موحەممەد: دەی چیتر کاک ماجید؟

ماجید: خاڵێکی دیکە کە زۆر گرنگە لام کە جەنابت مەلا موحەممەد حەکەمی نێوانمان بیت، حەق لە زاری هەرکەسێکمانەوە دەرکەوت جەنابت دیاری بکەیت و هەقەکە ئاشکرا بکەیت.

مەلا موحەممەد: گومانت نەبێت لەوەی کەوا دەکەم، چیتر؟

ماجید: هەر بابەتێکمان وروژاند تا تەواو دەگەینە ئەنجام، بابەتێکی دیکە نەکەینەوە و هیچ بابەتێک نەسپێرین بە بابەتێکی دیکە، هەر بابەتێکیشمان گەیاندە ئەنجام ئیتر نەیەینەوە سەری.

مەلا موحەممەد: زۆر باشە، زۆرم بە دڵە و هەرواش دەکەین.

عەزیز: منیش هاوڕام، هەروا دەکەین، هەرچەندە ئەوەی تۆ دەتەوێت بەدیهیاتە و پێویست ناکات بیڵێین، چونکە هەروا دەکەین و وامانکردووە پێشتریش.

ماجید: دە قوربان پرسیارەکەی پێشتر دووبارە بکەیتەوە مەمنوون دەبین.

مەلا محەمە: ئایا غەیری قورئان سروش(وحی)ـی دیکە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) هاتووە؟

ماجید: پێم خۆشە بەمجۆرەی لێبکەین و لە کاک عەزیز بپرسم، لای تۆ غەیری قورئان وەحی تر هاتووە بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ)؟

عەزیز: نەخێرا چونکە پێم وایە هەموو ئەوانەی دەڵێن سوننە و فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەحیین، هەموو دەلیلەکانیان زەعیفن و هەمووی تەئویلن بۆ ئایەتەکانی قورئان، سەرەڕای ئەوە من چۆن باوەڕ بکەم بە فەرموودە کە وەکوو قورئان بە موتەواتری و کۆنەکراوەتەوە، چۆن باوەڕ بکەم بە سوونەیەک کە دوای چەندین ساڵ دوای وەفاتی سەروەرمان کۆکراوەتەوە ... هتد

ماجید: کاکی خۆم جارێ با لەسەر ئەوە لێبببینەوە کە ئایا پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەحیی بۆ هاتووە غەیری قورئان یان نا! دواتر ئەوەی تر زۆر

ئاسانه وەلامت دەدەمەوە بە ئیزنی خوا، بۆیە پێت وا نییە غەیری قورئان وەحی بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاتبێت؟

عەزیز: نەخێر تۆ بەڵگەت چییە بۆ ئەوەی کە غەیری قورئان، وەحی هاتبێت بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ)!

ماجید: زۆرباشە، کەوایە بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ بەڵگە بۆ ئەوەی کە غەیری قورئان وەحی بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاتووە زۆرن، هەر لە قورئاندا زۆر زۆرن، بۆیە منیش دەچمە خزمەتی هەندێک ئایەت کە پێم وایە بەڕێزتان لێی تێدەگەن و لێشی نەگەشتن پرسیارم لێبکەن کە ئەو ئایەتەم بۆ کردووەتە بەڵگە ئێستا چەند ئایەتێک دەخوێنمەوە و دەیکەمە بەڵگە بۆ قسەکانم، پرسیارت لەسەر هەرکامیان هەبوو بیکە و لە هەرکامێکیشیان تێگەشتبووی من پرسیارت لێدەکەم ...

عەزیز: زۆر باشە بەس یەک ئایەت، یەک ئایەت بیڵێ، فەرموو!

ماجید: زۆر باشە، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا ۗ وَمَا جَعَلْنَا الْقِبْلَةَ الَّتِي كُنتَ عَلَيْهَا إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يَتَّبِعُ الرَّسُولَ مِمَّن يَنقَلِبُ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ ۚ وَإِن كَانَتْ لَكَبِيرَةً إِلَّا عَلَى الَّذِينَ هَدَى اللَّهُ ۗ وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَانَكُمْ ۚ إِنَّ اللَّهَ بِالنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾[1]

عەزیز: ئەم ئایەتەت بۆ کردووەتە بەڵگە؛ ئەوە چ بەڵگەیەکی تێدایە!

ماجید: ئێ زۆر باشە وەک خۆت دەزانی ئەو ئایەتە باسی ئەو واقیعە دەکات کە موسڵمانان ڕوویان لە (مەسجدولئەقصا) بوو، دواتر خوای گەورە فەرمووی بۆیە سەرەتا پێمان وتن یان سەرەتا بۆ ماندانابوون کە

---

(1) [البقرة: ١٤٣]

ڕووبکەنە مەسجیدولئەقصا تەنیا لەبەر ئەوە بوو بزانین کە کێ شوێنی پێغەمبەر (ﷺ) دەکەوێت، ئیتر لەمەودوا ڕووبکەنە مەسجیدولحەرام -کە کەعبەی ئیستا دەکات-.

بەڵگە هێنانەوەی من بەم ئایەتە دوو سێ شتە:

یەکەم: ئایا پێش کەعبە ڕووی موسڵمانان لە ئەقصا بوو؟

دووەم: بە چ بەڵگەیەک ڕووگە ئەقصابوو؟

سێیەم: کوا لە قورئاندا هاتووە کە ڕووبکەینە ئەقصا؟

عەزیز: نا ئەوە بەڵگە نییە، چونکە ئەو (جَعَلْ)ـە کۆن بووە، هەر پێش پێغەمبەر (ﷺ) ڕووکراوەتە ئەقصا، بەڵام لەبەر حەزی پێغەمبەر (ﷺ) ڕووگە گۆڕدراوە وەک قورئان دەفەرمووێت: ﴿قَدْ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي السَّمَاءِ ۖ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَاهَا ۚ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ ۚ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّوا وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُ ۗ﴾[1] ئەوەتا زۆر بە وازحی پێغەمبەری خوا (ﷺ) حەزی کردووە ڕووگەی لە ئەقصا نەبێت، بۆیە ئەوە هیچ بەڵگە نییە ...

ماجید: با برا گیان بەڵگەیە، چونکە وەک دەبینی دەفەرمووێت: ﴿وَمَا جَعَلْنَا الْقِبْلَةَ الَّتِي كُنتَ عَلَيْهَا إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يَتَّبِعُ الرَّسُولَ﴾[2] ئەوەی کە دیارە لە ئایەتەکەدا (جَعَلَ)ی خوای گەورەیە بۆ قیبلەیەک کە ئەقصایە، کوا ئەو ئەمرە بۆ موسڵمانان کە خوا فەرمووبێتی ڕووبکەنە مەسجیدولئەقصا؟ بە وازحی ئەو ئەمرە دەگەڕێتەوە بۆ وەحی خوای گەورە و ئەو ئەمرەش لە قورئاندا وجودی نییە! ئەی دەبێت کێ ئەو ئەمرەی کردبێت کە ڕووبکەنە ئەقصا، نایەم ئەو فەرموودانە بهێنم کە کێ ئەمری کردووە هەر قورئان

---

(1) [البقرة: ١٤٤]

(2) [البقرة: ١٤٣]

پێمان دەفەرمووێت، ئەو (جَعَلْ)ی خوای گەورە کە وتویەتی ڕووگەتان با ئەقصا بێت تەنیا بۆ تاقی کردنەوەی ئیمانداران بووە، بزانێت کێ شوێن موحەممەد پێغەمبەر (ﷺ) دەکەون، کەوایە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەمری فەرمووە بۆ ئەوەی ڕووبکرێتە ئەقصا و ئەم ئەمرەش لەلایەن خواوە هاتووە، بۆ؟ چونکە فەرمووی (وَمَا جَعَلْنَا) بۆیە زۆر وازحە ئەمە و پێویست بە موناقەشە ناکات ...

عەزیز: وەک وتم ئەو (جَعَلْ)ە کۆنە و پێش پێغەمبەریش (ﷺ) هەر ڕوو کراوەتە مەسجیدولئەقصا، بۆیە ئایەتێکی تر بهێنەوە و بیکە بەڵگە ئەوە نابێتە بەڵگە.

ماجید: کاکە عەزیز برام ئەوە وەک وتم کۆن نییە و ئەوە لە سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ)دا کراوە و (جَعَلْ)ەکە بۆ سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) بووە و وەک لە ئایەتەکەدا زۆر بە وازحی دیارە، چونکە ئەوەتا خوای گەورە دەفەرمووێت﴿لِنَعْلَمَ مَن يَتَّبِعُ الرَّسُولَ﴾ ئەمەش تەواو واتای ئەوە دەدات کە ئەم (جَعَلْ)ە بۆ سەردەمی پێغەمبەرە (ﷺ). ئەمە هەر سیاقی ئایەتەکە سەلمێنەری ئەوەیە. سەرەڕای ئەوەش وێنای ئەم ئایەتە زۆرە لە قورئاندا کە سەلمێنەری ئەوەیە سروش و وەحی دیکە دیکە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) هاتووە بۆ نموونە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿مَا قَطَعْتُم مِّن لِّينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَائِمَةً عَلَىٰ أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ اللَّهِ وَلِيُخْزِيَ الْفَاسِقِينَ﴾[1].

عەزیز: مەبەست چییە و بەڵگەبوونی ئەم ئایەتە لەکوێدایە؟

ماجید: ئەو ئایەتە زۆر وازحە کە باسی «یەهود» دەکات کاتێک موسڵمانان دەوریان گرتن و دارە خورماکانیان شکاند و سووتاند، خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرمووێت: ئەو دارانەی بڕیتانەوە بە ئیزنی خوا کراوە

---

(1) [الحشر: ٥]

و خوای گەورە ئیزنی پێدان بۆ بڕینەوەی، کوا ئەو ئیزنەی پەروەردگار بۆ ئەو کارە؟ کوا لە قورئاندا ئەو ئیزنەم پێش چاوناکەوێت!

عەزیز: کورە برام ئەوە هەر بەڵگە نییە، خوای گەورە هەموو شتێک ئیزنی ئەوی لەسەر نەبێت ڕوونادات، بەڵێ ئەو دارانە بڕاونەتەوە ئیزنی ئەوی لەسەر بووە، وەک خوای گەورە لە چەندان شوێندا ئەوە دەفەرمووێت.

ماجید: برام نا ئەوە شتێکی ترە، بۆیە ئێمە دەبێت ئاگاداربین مامەڵە لەگەڵ قورئان دەبێت بە تەدەبور بیکەین و ئاگاداربین ئەو لەفزە بۆ بەکاردێت و چۆن بەکارهاتووە، کاک عەزیز گیان سەیر بکە زۆرینەی ئەو ئیزنانەی خوای گەورە بۆ شتانێکی عەکسی عادەت هاتوون بۆ نموونە: ﴿وَرَسُولًا إِلَىٰ بَنِي إِسْرَائِيلَ أَنِّي قَدْ جِئْتُكُم بِآيَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ ۖ أَنِّي أَخْلُقُ لَكُم مِّنَ الطِّينِ كَهَيْئَةِ الطَّيْرِ فَأَنفُخُ فِيهِ فَيَكُونُ طَيْرًا بِإِذْنِ اللَّهِ ۖ﴾[1] تەماشا بکە ئەوەی بۆ عیسا (علیه السلام) دانرابوو بە موعجیزە شتانێکن عەکسی عادەتی خەڵکین کە لە قور شێوەی باڵندە دروست بکات و فووی پێدا بکات ببێتە باڵندەیەک و بفڕێت.

ئەگەر تەماشا بکەیت جۆرێک ئەم ئایەتی بڕینەوەی دارەش ئاوەهایە ئەصل ئەوەیە کە موسڵمان نابێت دار ببڕێتەوە و قورئانیش زەمی ئەو جۆرە کەسانەی کردووە کە (حرث و نسل) فەساد دەکەن، بۆیە موسڵمان نابێت ئەوە بکات هەتا خوای گەورە ئیزنیان نەدات لەڕێگەی پێغەمبەرەکەیەوە (ﷺ) و خوای گەورە ڕێگەیداوە بە موسڵمانان کە ئەو کارە بکەن و خوای گەورەش ئەو ڕێگەدانە دەداتە پاڵ خۆی و ئەمری پێدەکات ...

عەزیز: بەڵگەت چییە! کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەو ئەمرەی دابێتە پاڵ خوا و وتبێتی بە ئەصحاب دارەکان ببڕن؟

---

(1) [آل عمران: ٤٩]

ماجید: کاکە عەزیز گیان! چاوەکەم! بەڵگەم زۆرە بۆ سەلماندنی ئەمە بە فەرموودە و ڕیوایات! بەڵام وەک مەبەستمانە و مەبەستیشمە تەنیا بە قورئان قسە بکەین، چونکە خاڵی هاوبەشی نێوان من و تۆیە و بەڵێنیشمان لەسەری داوە کە وابەستەی ئەم خاڵە ببین، ئەمری قورئانیشە لەگەڵ موخالیفەکانمان لەسەر خاڵی هاوبەش کۆببینەوە و زۆر لەسەر شتە ناکۆکەکان قسە نەکەین، وەک قۆن لە قورئاندا دەفەرمووێت: ﴿قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْا إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَاءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ﴾[1] بۆیە بەڵگەم تەنیا ئایەتەکەیە وەک پێم وتی ئەمە کارێکە نابێت موسڵمان بیکات وەک شەرع، بۆیە هەرکات بیکات ئیلا دەبێت ئیزنێکی یاسادانەر هەبێت و ئیجازەیەک درابێت، حەتمەن ئەو ئیجازەیە لە قورئاندا بوونی نییە و خواش دەفەرمووێت من ئیزنم داوە، بۆیە حەتمەن وەحییەک بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاتووە و قورئانیش نەبووە.

عەزیز: دەی با منیش پرسیارێکت لێ بکەم!

ماجید: تکا دەکەم! وەک ڕێککەوتین با بابەتێک لێببینەوە دواتر بچینە سەر بابەتێکی تر، چونکە چەندان ئایەت ماون کە هەر باسمان لێوە نەکردووە، بۆیە ئەگەر ئیجازە بدەیت بەڵگە و ئایەتی دیکە دەهێنمەوە بۆ ئەوەی بیسەلمێنم غەیری قورئان وەحی دیکە بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاتووە.

عەزیز: دەی فەرموو!

ماجید: ببورە مەلا موحەممەدی خۆشەویست جەنابتمان لەنێوان خۆمان دەرکردووە و گفتوگۆیەکی برایانە دەکەین، هەرکات لاماندا تکام وایە بمانگەڕێنیتەوە بۆ سەر بابەتەکە.

---

(1) [آل عمران: 64]

مەلا موحەممەد: فەرموو برام!

ماجید: بەڵگەیەکی دیکە دەخەمە خزمەتتان وەک خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ الرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَائِكُمْ ۚ هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ ۗ عَلِمَ اللَّهُ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَخْتَانُونَ أَنفُسَكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ وَعَفَا عَنكُمْ ۖ فَالْآنَ بَاشِرُوهُنَّ وَابْتَغُوا مَا كَتَبَ اللَّهُ لَكُمْ ۚ﴾[1].

عەزیز: وەک هەموو جارێک هۆکاری هێنانەوەی ئەو ئایەتە بە بەڵگە بهێنەوە و ڕوونی بکەوە بۆ بەڵگەیە؟

ماجید: برام ئەوە زۆر وازحە کە پێش ئەم ئایەتە حەرام بووە، چونکە لای خێزان لە شەوی ڕەمەزاندا، ئیتر خوای گەورە لەبەر ئەوەی ئەصحاب بێتاقەت بوون بەوە و مەشەقەیەکی گەورە بوو لەسەریان و زۆریان زوڵمیان لە خۆیان دەکرد و دەکەوتنە نێو تاوانەکەوە، ئیتر خوای گەورە کە عالیم بوو بە نەفسەکان فەرمووی ئەوە حەڵاڵم کرد بۆتان کە شەوانە بچنە لای خێزانەکانتان و خوای گەورەش دەزانێت هەندێکتان زوڵمتان لە خۆتان دەکرد و ئەو بێ ئەمرییەتان ئەنجامدەدا، ئەوە خوای گەورە لێتان خۆش بوو، لەو تاوانانەی کردووتانە و ئیستا دەتوانن موباشەرە بکەن لەگەڵ خێزانەکانتان شەوانی ڕەمەزاندا.

پرسیارەکە لێرەدایە؛ کە ئایا ئەم تەحریمی چوونە لای خێزان بە چ نەصێک بووە؟ کوا لە قورئاندا بوونی نییە ئەو دەقە بۆ تەحریمی چوونە لای خێزانتان لە شەوانی رەمەزاندا، دەبێت ئەو ئەمرە لەلایەن یەکێکی ترەوە هاتبێت، ئەمەش وازحە لە سووننەتی پێغەمبەری خوادا کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەمری فەرمووە بەوەی کە نەچنە لای خیزانیان لە شەوانی ڕەمەزاندا و ئەم ئەمرەش قورئان دانی پێدا دەنێت کە خوای گەورە قبووڵی

---

(1) [البقرة: ١٨٧]

بووە، یان خۆی فەرموویەتی، چونکە دەفەرموویت (أحِلَ) واتە حەلاڵمانکرد کەوایە پێش ئەوە حەرامبووە.

عەزیز: هەموو جارێک (أُحِلَّ) بەمانای ئەوە نایەت کە پێشتر شتێک حەرام بوو بێت، ئەو مانایە تەکەلوفە و بەزۆر دەتەوێت بیگونجێنیت.

ماجید: بە پێچەوانەوە ئەوەتا خوای گەورە دوای ئەوە دەفەرموویت (وَعَفَا عَنكُمْ) واتە لێتان خۆشبووم، ئەگەر ئەو چوونە لای خێزانە حەرام نەبووبێت، چۆنە خوای گەورە تاوانی بۆ نووسیوون تا ئیستا لێیان خۆشببێت؟ وەک وتم لەسەرەتادا با بە تەدەبور و لێکۆڵینەوەوە بچینە خزمەتی ئەم قورئانە، بە خوا شیفایە بۆ سنگەکانمان و وەڵامی تەواوی قسەکانتانی تێدایە، بۆیە ناکرێت خۆمان لەو واتا ڕوونە بدزینەوە کە خوای گەورە دەفەرموویت (أُحِلَّ) واتە پێشتر حەرام بووە و ئەو حەرامییەش پێشتر لە قورئاندا بوونی نەبووە و وەحی خواییش بووە، لێرەش وازح دیارە کە خوای گەورە وەحی بۆ پێغەمبەر (ﷺ) نازڵ کردووە کە قورئانیش نەبووە.

عەزیز: کاکە گوڵ گیان ئەوە بەڵگەیەکی زەعیفە و شێر و ڕێوی زۆرت بۆ هێنایەوە بەڵگەی حاشا هەڵنەگر بهێنەوە با هیچ گومانێک هەڵنەگرێت.

ماجید: هەرچەندە جوان نییە تۆ بەو بەڵگە ڕوون و ئاشکرایانە خۆت لە خەت دەدەیت و قەناعەتیان پێ ناکەیت، بەڵام تا ئەوە نەسەلمێنم پێت کە وەحی بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاتووە و قورئانیش نەبووە واز ناهێنم، ئامادەم زیاتر لە پەنجا ئایەت بهێنمەوە تا قەناعەت دەکەیت بەو بابەتە. من چەند ئامادەم قەناعەت بە تۆ بهێنم، سەد ئەوەندەش بۆ ئامادەبووان.

عەزیز: دەی فەرمووو چاوەڕێین.

ماجید: لە ئایەتێکی تردا خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَإِذْ أَسَرَّ النَّبِيُّ إِلَىٰ بَعْضِ أَزْوَاجِهِ حَدِيثًا فَلَمَّا نَبَّأَتْ بِهِ وَأَظْهَرَهُ اللَّهُ عَلَيْهِ عَرَّفَ بَعْضَهُ وَأَعْرَضَ عَن

بَعْضٍ فَلَمَّا نَبَّأَهَا بِهِ قَالَتْ مَنْ أَنبَأَكَ هَٰذَا قَالَ نَبَّأَنِيَ الْعَلِيمُ الْخَبِيرُ﴾[1] ئەم ئایەتە زۆر ڕوونە و حاشا هەڵنەگرە و دڵنیام نێوانمان یەکلایی دەکاتەوە.

عەزیز: کوا چی تێدایە؟ هیچ ڕوون نییە؟

ماجید: کاکە گیان ئەمە بەڵگەیەکی حاشا هەڵنەگرە بۆ ئەوەی خوای گەورە غەیری قورئان وەحی تری بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناردووە، بەس جارێ هەندێک پرسیارت لێدەکەم:

وشەی (الْعَلِيمُ الْخَبِيرُ) وەسفە بۆ کێ؟

عەزیز: هەڵبەتە ئەوە ئەو کەسەیە کە هیچ شتێکی لێناشاردرێتەوە کە خوای گەورەیە (جل جلالە).

ماجید: «بارك الله زادك الله علما» برام ئەم ڕووداوە من ناچمە نێو ڕیوایات کە چی بووە لەنێوان دایکمان حەفصە و دایکمان عائشە (خوا لێیان ڕازی بێت)، لەبەر ئەوەی وتمان نابێت غەیری قورئان باس بکەین، وەک لە ئایەتەکەدا دیارە پێغەمبەری خوا (ﷺ) شتێکی لەلای خێزانێکی حەفصە بە نهێنی(صر)ی دانا، خێزانەکەشی چوو بڵاوی کردووەتەوە لای دایکمان عائیشە، خوای گەورەش بە پێغەمبەر (ﷺ)ی فەرمووە ئەو سرە کەشفکراوە و بڵاوکراوەتەوە و بە تەفصیلی ئەمە بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتراوە، حفصەی خێزانی پێغەمبەریش (ﷺ) شکی کردووە کە عائشە پێی وتبێت، بە پێغەمبەری خوا (ﷺ)ی وت کێ پێی وتوی کە من کەشفم کردووە و ئاوام وتوە، پێغەمبەری خواش (ﷺ) فەرمووی خوای گەورە پێی فەرمووم.

عەزیز: جا ئەمە کەی باسی وەحی تێدایە؟

---

(1) [التحریم: ٣]

ماجید: باشه برا گیان کۆمەڵێک قسەی ئەمانەت هەبووە لەنێو خێزانەکانی پێغەمبەر (ﷺ)، وایە؟

عەزیز: بەڵێ لە ئایەتەکە وادەردەکەوێت.

ماجید: دەی برا گیان ئەو قسانە کێ بە پێغەمبەری خوا (ﷺ)ی فەرموو، کێ بۆی گێڕایەوە؟

عەزیز: دیارە لە ئایەتەکەدا کە خوای گەورە گێڕاویەتەوە و پێیوتوە؟

ماجید: بارک اللّٰه، دەی منیش هەر ئەوە دەڵێم، ئەو سڕانەی کە خوای گەورە بۆ پێغەمبەر (ﷺ)ی کەشف کردووە بە پێغەمبەر (ﷺ)ی فەرمووە کوان؟ لە قورئاندا بۆ بوونی نییە؟ جا برام ئەمەیان زۆر وازحە بۆیە ناتوانین لێی ڕابکەین، خۆت دەزانی کە شتێکی شاراوە هەبوو لەنێوان دوو خێزانی پێغەمبەر (ﷺ)دا، وە (علیم الخبیر) بۆ پێغەمبەر (ﷺ)ی گێڕاوەتەوە، ئەم گێڕانەوەیەش دەبێت وەحیی بێت، ئەم وەحییەش لای تۆ تەنیا قورئانە، بۆ ئەمەش لە قورئاندا باسنەکراوە؟ چونکە وەک لە ئایەتەکەدا ڕوونە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەموو ئەو سڕەی لەنێوانیاندا هەبوو هەمووی پێ وتراوە، باشە ئەو قسانە کوان لەکوێی قورئاندا هەن؟ کەوایە پێغەمبەری خوا (ﷺ) غەیری قورئان وەحی دیکەی بۆ هاتووە و لە قورئانیشدا نەنوسراوەتەوە.

مەلا موحەممەد: باشە برایان با لەو پرسیارە ببینەوە، هەڵەبت زۆر لەسەری دواین و چەندی تریش قسەی لەسەر بکەین تامی تەواو نابێت، چونکە لە خزمەتی ئایەتەکانی خوای گەورە داین، بۆیە پێم خۆشە ئەوە هەمووومان دانی پێدا بنێین کە؛ بەڵێ، دەکرێت تەفسیری ئەو ئایەتانە بکەین بەوەی کە وەحی دیکە غەیری قورئان بۆ پێعەمبەری خوا هاتووە، بەڵام پرسیارێکی تر دێتە پێشەوە کە ئایا ئەو وەحییە کە غەیری قورئان هاتووە بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ)، مولزیم بووە یان نا؟

ماجید: مەلا موحەممەد گیان ئەوە پێکەوە ئەوەمان بیرخۆمان هێنایەوە کە هەر قورئان دەیان ئیشاراتی تێدایە کە سەلمێنەری ئەوەن غەیری قورئان وەحی و سروش بۆ پێغەمبەری خودا (ﷺ) هاتووە، بۆیە لە کاک عەزیز دەپرسم: تۆش لەگەڵ ئەمەیت؟ چونکە وەک وتم هەر شتێکمان وروژاند پێویستە بگەینە ئەنجام و پاشان بابەتێکی دیکە بکەینەوە.

عەزیز: بەڵێ! منیش لەگەڵ ئەوەم کە غەیری ئەم قورئانە بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاتبێت و دەکرێت وا بڵێین، بەڵام تەواوی ئەو ئایەتانە و ئەو وەحیانە نەسخ کراونەتەوە و نەماون هەمووی مەنسوخن، چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَا نَنسَخْ مِنْ آيَةٍ أَوْ نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَا أَوْ مِثْلِهَا ۗ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾[1]، بۆیە تەواوی ئەو وەحیانەی تر مەنسی و مەنسوخن، تۆش پێت وانییە؟

ماجید: لەسەر ئەوەی کە نەسخە و مەنسییە دواتر دەچینە خزمەتیان، وەک وتم کاتێک بابەتێکمان کردەوە، هیچ بابەتێکی دیکە باسناکەین تا نەگەینە ئەنجام، بۆیە دووبارە دەپرسم وەحی و سروشی تر هاتووە بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) غەیری قورئان؟

عەزیز: بەڵێ هاتووە.

ماجید: دەی ئیتر قەینا، با بچینە سەر پرسیاری دووەمی مەلا موحەممەد کە فەرمووی ئایا ئەو وەحیانەی کە غەیری قورئان هاتوون مولزیم بوون یان نا؟

عەزیز: بەڵێ مولزیم بوون بۆ ئەوکات، بەڵام ئیستا نا!، چونکە مەنسوخن.

---

(1) [البقرة: ١٠٦]

ماجید: باشە الحمدلله کەوایە تا شوێنێکی باش هاتووین، کەوایە وەحی دیکە غەیری قورئان هاتووە و مولزیمیش بووە؟ ئەگەریش مولزیم بووە، بیسەلمێنە چۆن!

عەزیز:بەڵێ!، بۆ نموونە ئەو دوو سێ ئایەتەی تۆ هێناتەوە، خوای گەورە پێشتر لە شەوی ڕەمەزاندا جووت بوونی لەگەڵ خێزانا حەرمکردبوو، ئەوەش بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە موسڵمانان مولزەم بوون بەو ئەمرەوە و هەتا حەرەج و ماندوێتی بۆ دروستکردبوون و هەندێکیشیان دەکەوتە حەرامەوە و تاوانبار دەبوون، وەک خوای گەورە دەفەرمووێت: (لێتان خۆشبووم)، کەوایە تاوانباریش بوون و ئەو حوکمانە حوکمی ئیلزامی بوون.

ماجید: بارک الله و زادک الله علما، زۆر باشە کەوایە نایەوێت نموونەکانی تر باس بکەین، چونکە بەڕاستی هەموویان نیشانی دەدەن کە وەحی غەیری قورئان هاتووە و هەمووشی مولزیم بوون لەسەر موسڵمانان.

مەلا موحەممەد: زۆر باشە کەوایە ئێستا دەچینە نێو کرۆکی بابەتەکە و دەپرسین: ئایا پێغەمبەری خوا (ﷺ) مافی یاسادانانی پێدراوە؟

ماجید: دەی باشە ئەوە لەوەش بووینەوە کە غەیری قورئان وەحی هەبووە و وەحییەکەش مولزیم بووە، ئەمە تەواو دایدەخەین و دەچینە سەر بابەتێکی تر کە ئایا قورئان حەقی ئەوەی داوە بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە حوکم بکات و یاسا دابنێت، لە غەیری ئەوەی قورئان دەیفەرمووێت؟ وە ئایا پێغەمبەری خوا (ﷺ) تەنیا بەلاغ و ئاگادارکردنەوەی لەسەر بووە؟

عەزیز: برای بەڕێزم ئەو پرسیارە مەتاتییە چییە! پێغەمبەری خوا (ﷺ) نێردراوی خوایە و خوای گەورە لەناو ئەو هەمووە مرۆڤە ئەوی هەڵبژاردووە کە بیکاتە پێغەمبەر (ﷺ)، بەڵام ئیتر ئەوە پێغەمبەر (ﷺ)لە و نامەهێنەرە نەک خوایەکی تر، لە پاڵ قورئاندا ئەویش بڵێت من هەم

و فەرمودەکانم کار پێبکەن و هەتا فەرموودەکانی نەسخی قورئان بکات وەک لە زۆربەی مەصادیری حەشەویەکان دەیبینین، بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) تەنیا ئەوەی لەسەر بووە قورئان بگەیەنێت و قورئان هەرچی پێ وتوە کردوویەتی و ئەمری پێکردووە و هەرچی نەهی لێکردووە نەیکردووە و نەهیشی لێکردووە، وەگەرنا نەیتوانیوە هیچ حوکمێک بدات کە قورئان نەیوتبێت!

ماجید: برا گیان! پرسیارەکەی من مەتاتی نییە، بەڵکوو جوابەکەی تۆ زۆر مەتاتییە، وەرە با پێکەوە بچینە خزمەتی قورئان بزانین چیمان پێ دەفەرموویت، بۆ نموونە: خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُو اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ وَذَكَرَ اللَّهَ كَثِيرًا﴾[1]، ئەم ئایەتە مانای چییە و تەفسیری بکە!

عەزیز: ئێ ئەوە دیارە خوای گەورە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەکاتە ڕێنمونی بۆمان و دەیکاتە باشترین نموونە کە ئێمە چاوی لێبکەین، ئەمەش هەمووی لە قورئاندا هاتووە، کە پێغەمبەر (ﷺ) چۆن بووە، بۆ نموونە: کە دەفەرموویت ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ﴾[2]، ئەمە بۆخۆی چەند سیفەتێکی پێغەمبەر (ﷺ)ە، چاک لەگەڵ خەڵکی، بەخشندە لەکاتی توڕەیی، دوور لە ڕق و کینە، وە هەم وەک ئایەتی: ﴿وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ﴾[3]، وە چەندان ئایەتی تر کەلای تۆش ڕوونە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەو سیفاتانەدا پێشەنگە(ئوسوە)یە و باشترین پێشینە کە چاوی لێبکەین.

ماجید: ئێ کەوایە خوای گەورە ئەمر دەکات ئێمە چاوی لێبکەین،

---

(1) [الأحزاب: ٢١]

(2) [الأنبياء: ١٠٧]

(3) [القلم: ٤]

پێشت وایە ئەوەی لە قورئاندا هاتووە کە سیفەتی پێغەمبەرن (ﷺ) تەنیا وەک خەبەرێک مامەڵەی لەگەڵ ناکەیت، بەڵکوو شوێنی دەکەویت و وەک ئەو دەکەیت، چونکە خودا ئەمری کردووە شوێنی بکەویت و ئەو بکەیتە ئوسوە و ڕێبەری خۆت چاو لە ئاکار و مامەڵەی ئەو بکەیت؟ واتە ئەگەر زانیت شتێک یاخود ئاکارێک پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەنجامیداوە تۆ ئەنجامی دەدەیت، چونکە خوای گەورە ئەوی کردووەتە ئسوەی حەسەنە بۆ ئێمە؟

عەزیز: بێگومان بەڵێ، قورئان ئەو وەسفانەی کە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) ی کردوون هەموو قەتعین و سابتن بۆیە لە هەموو ئەوانەدا، شوێنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەکەوم ئەگەر کردبێتی دەیکەم و نەیکردبێت نایکەم!

ماجید: دەی زۆرباشە ئەوە پێکەوە ئەوەمان سەلماند کە دەبێت پێغەمبەری خوا (ﷺ) قودوە و پێشەوامان بێت و لە ئاکار و کردەوەکانیدا شوێنی بکەوین، کەوایە ئیستا کاتی ئەوەیە بزانین پێغەمبەری خوا (ﷺ) توانیویەتی یاسایەک دابنێت کە لە قورئاندا نەهاتووە! سەرەتا با بپرسم بزانم تۆ ڕات وایە پێغەمبەری خوا (ﷺ) غەیری قورئان هیچی تری وتوە لە دیندا؟ واتە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئیجتهاداتی کردووە و بیروڕای خۆی دەربڕیوە؟!

عەزیز: بەڵێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) غەیری قورئان شتی تری وتوە، وەک هەموو مرۆڤێک قسەی کردووە، وەک هەموو مرۆڤێک تێگەیشتنی هەبووە بۆ ئایەت وەک هەموو مرۆڤێک ئیجتهادی کردووە، چەندین جاریش هەڵەی کردووە و خوای گەورە بۆی ڕاستکردووەتەوە، ئەگەر وەحی بوایە هەڵەی نەدەکرد، بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە خەڵکی فەرمووە من مرۆڤێکم وەکوو ئێوە تەنیا جیاوازی من لەگەڵ ئێوەدا ئەوەیە کە من وەحی و سروشم بۆ دێت.

ماجید: برا گیان ئەوەی تۆ دەیڵێی هەمووی بەڵگەن لە سەرت نەک لە بەرژەوەندیت، بۆ نموونە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەڵەی کردووە و خوا بۆی ڕاستکردووەتەوە، کەوایە خوای گەورە هەموو ئاکارەکانی پێغەمبەر (ﷺ)ی بە دین زانیوە لە هەرشوێنێک وەک ئیجتهادێکی بەشەری کەوتبێتە هەڵەوە، ئەوە خوای گەورە دەستبەجێ بۆی ڕاستکردووەتەوە، کەوایە تەواوی ئاکارەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) تەواون هەڵەکانیشی دیاریکراون و ڕاستکراونەتەوە، بۆیە خوای گەورە وەک پێشووتر باسمان کرد ئەمری پێفەرمووین کە شوێنی بکەوین و بیکەینە پێشینی خۆمان، ئەوەی کە دەیڵێیت کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئیجتهادی کردووە وەک هەموو مرۆڤێک، زۆر سەیرە ئەو حەقە دەدەیتە خۆت ئیجتهاد بکەیت و خەڵکیش شوێنت بکەون، کەچی ئەو حەقە نادەیتە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە ئیجتهاد بکات و خەڵکی شوێنی بکەون.

عەزیز: کاکە ئەمە بابەتەکە ئاڵۆز دەکات، خۆت دەزانیت کە قورئان دەفەرموێت کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) مرۆڤێک بووە وەک ئێمە، تەنیا جیاوازی لەگەڵ ئێمە وەحی و سروش بووە، ئیتر وەحیش کە قورئانە کەوایە فەرقی پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ ئێمە تەنیا قورئانەکەیە نەک ئیجتهادی بەشەری، بۆیە وابزانم قسەکانم ڕوونە!

ماجید: برای بەڕێزم ئەوەی کە پێم وایە موناقەشەکە یەکلایی دەکاتەوە ئەویش ئەوەیە کە تەفسیری ئەم ئایەتەم بۆ بکەیت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ مِنكُمْ ۖ فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ﴾[1]؟

عەزیز: زۆربەتان ئەو ئایەتە دەکەنە بەڵگە بۆ ئەوەی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەک خوای گەورە دەبێت بە گوێی بکرێت، لەکاتێکدا کە لە ئایەتەکە

---

(1) [النساء: ٥٩]

ورد دەبینەوە دەبینین، کە ئەو ئایەتە باسی دوو جۆر گوێڕایەڵی و تاعە دەکات، کە یەکێکیان بۆ خوایە و یەکەکەی تر بۆ پێغەمبەر (ﷺ) و وەلی ئەمرە، وە پێغەمبەر (ﷺ) و وەلی ئەمر لە حاڵی ژیانیان بە گوێیان دەکرێت، بۆیە هەموو ئەو ئایەتانەی تریش دەبینین هەموو واجبکردنی ئیتاعەی ڕەسولە، واتە لە حاڵی پێغەمبەرایەتییەکەیدا (واجب الاتباعە) وەک وەلی ئەمری موسڵمانان کە لەکاتی حوکمیدا واجبە گوێرایەڵی بکرێت، بەڵام لەکاتێکدا کە بە هەرهۆکارێکی شەرعی دەستی لەکارکێشایەوە، یان مرد و یەکێکی تر بوو بە وەلی ئەمر ئیتر گوێرایەڵی ناکرێت.

ماجید: مامەگوڵ گیان ئەوەی تۆ دەیڵێیت کاتێک ڕاستە کە یەکجار وشە و ئەمری ئیتاعە هاتبێت وەک ئایەتی: ﴿وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَخْشَ اللَّهَ وَيَتَّقْهِ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْفَائِزُونَ﴾[1] ئەمە یەکجار وشەی ئیتاعە هاتووە و ئیتاعەکانی تر تەبەعین، چونکە ئەوەتا لەو ئایەتەدا زۆر بە ڕوونی دیارە کە ئیتاعەی خوا و پێغەمبەر (ﷺ)ی بە یەک ئیتاعە هێناوە، وەک لە ئایەتێکی تردا دەفەرموویێت: ﴿مَّن يُطِعِ الرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ﴾[2]، کە دیارە هەرکەسێک بە گوێی پێغەمبەر (ﷺ)ی خوای کردبێت کەوایە بە گوێی خوای کردووە، بۆیە پێم وتی تەفسیری ئەو ئایەتە بکە بۆ ئەوەی نەکەویتە ئەو هەڵەیەوە کە کردت، وەرە با پێکەوە تەفسیری بکەینەوە خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ مِنكُمْ ۖ فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ﴾[3] ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموویێت ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە گوێڕایەڵی خوا و گوێڕایەلی پێغەمبەر (ﷺ) و کاربەدەستانتان بکەن کە لە خودی خۆتانن، جارێ با لێرەدا هەڵویستەیەک بکەین، من پێم وایە ئەمە سێ جۆر ئیتاعەیە، یەکێک گوێڕایەڵی خوایە کە

---

(1) [النور: ٥٢]

(2) [النساء: ٨٠]

(3) [النساء: ٥٩]

لە قورئاندا ئەمرەکانی دەبینین واجبە گوێڕایەڵی بکەین، دووەم گوێڕایەڵی هی پێغەمبەری خوایە (ﷺ) کە دەبێت بە گوێی بکەین لە هەموو شتێکدا و دڵنیاشین کە جیاوازە لە قورئان، چونکە ئیتاعەی خوا و پێغەمبەر (ﷺ) هەر قورئان بێت، موستەحیلە و ناگونجێت خوا بفەرمووێت بە گوێی قورئان بکەن بە گوێی قورئان بکەن، دووجار ئەوە بفەرمووێت، بۆیە گوێڕایەلی پێغەمبەر (ﷺ) غەیری قورئانە، کە ئەویش پێم وایە وتەکانی خۆیەتی کە ناودەبرێن بە سووننە و فەرموودە و حەدیس و ئەوناوانەی تر.

عەزیز: برا گیان با نەکەوینە سەفسەتەوە، وەک چۆن وەلی ئەمر تاعەی لە حالی حەیاتیدا واجبە، پێغەمبەری خواش (ﷺ) تاعەی لە حالی حەیاتیدا واجبە، ئەمە قسەکەی منە، ئایا ئێستا تۆ بە گوێی قسەکانی سەددام[1] دەکەیت؟ ئەی کە مابوو لە ژیاندا هەموو عێراق بە گوێیان نەدەکرد.

ماجید: برا گیان تەعامولی تۆ و گوێڕایەڵی تۆ بەرانبەر قسەیە، واتە دەبێت قسەیەک بکرێت، پاشان گوێڕایەڵی ئەو قسەیە بکەیت، کاتێک دەڵێت گوێڕایەڵی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بکە واتە گوێڕایەڵی قسەکانی بکە، خۆشت دەزانی ئەصل لە قسەدا زیندووییە و وشە و قسە نامرن و ئەصل تێیاندا حەیاتە، وەک چۆن زانایان دەفەرموون: (الاجتهاد لایموت بموت صاحبە) بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئێستا پێغەمبەری تۆیە و پێغەمبەری هەموو مرۆڤەکانی دوای ئێمەشە، وەک چۆن دەفەرمووێت: {إِنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيۡكُمۡ جَمِيعًا} بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) تەنیا ڕەسولی سەردەمی هاوەڵان نەبووە، بەڵکوو ڕەسولی ئێمەشە و ڕەسولی دوای ئێمەشە، بەڵام پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێغەمبەرمانە بە وەفاتکردنی واتای ئەوە نییە کە بە ڕەسولی خوا نەماوە، ئیستاش هەر پێغەمبەرمانە و کەلامەکانیشی زیندوون و هەن کەوایە گوێڕایەلی واجبە، نموونە هێنانەوەشت بە سەددام جوان نییە،

---

(١)مەبەست پێی «سەددام حوسێن»ـە کە لە ساڵانی ١٩٧٩ تا ٢٠٠٣ سەرۆکی عێراق بووە.

بەڵام سوودبەخشە بۆ تەوەرەکە. ڕاستە سەددام مردووە، بەڵام ئێستاش زۆرینەی یاسا و ڕێساکانی مەحکەمە و دام و دەزگاکان هەمانە ئەو یاسا و ڕێسایانەن کە سەددام واژۆی کردوون و بە مردنیشی قسەکان و بڕیارەکانی نەمردوون و ئێستاش بە گوێی دەکرێت.

عەزیز: بەڵگەی تر چی هەن؟ چونکە هێشتا بەڵگەکانت لە ئاستی سەلماندنی داوەکەتدا نییە.

ماجید: مەلا موحەممەد پێم خۆشە جەنابت بڕیار بدەن کە بەڵگەکانم لە ئاستی بابەتەکەدان یاخود نا!، چونکە هەم منیش و هەم کاک عەزیزیش بەڵگە دەهێنینەوە و ئەوەی ناوبژیوان و بڕیاردەرە ئێوە و ئامادەبووانن.

مەلا موحەممەد: کاک عەزیز حەقی خۆیەتی کە بڵێت بەڵگەکانت سەلمێنەر نین و ئەوەش وا دەخوازێت بەڵگەی دیکە بهێنیتەوە، ئەوەش بۆ تۆ باشترە زیاتر مەجالی قسەت دەبێت، چونکە تا کاتی خۆتە زۆرینەی قسەکان و پرسیارەکان تۆ دەیکەیت و دواتر دێتە سەر کاک عەزیز ئەوکات بەس ئەو پرسیارت لێدەکات و دەبێت تۆ وەڵامی بدەیتەوە.

ماجید: ئێ زۆر باشە چەندان ئایەتی دیکە نموونەی ئەم داوایەن و سەلمێنەری ئەم ڕاستییەن، وەک خودای گەورە دەفەرمووێت:

﴿إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ الْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَن يَقُولُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا ۚ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾[1]، ئەوەتا خوای گەورە دەفەرمووێت گوفتاری ئیمانداران ئەوەیە کاتێک بانگدەکرێن بۆ لای حوکمی خوا و پێغەمبەرەکەی، یەکسەر دەڵێن بیستمان و گوێڕایەڵی دەکەین، باشە حوکمی خوا قورئانە ئەی حوکمی ڕەسول چییە؟

---

(1) [النور: ٥١]

ئایەتی: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ وَمَن يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا مُّبِينًا﴾، ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموویت بۆ هیچ موسڵمانێکی ژن و پیاو نییە کە سەرپشک بن لە ئەنجامدان، یان ئەنجامنەدانی کارێک کە خوا و پێغەمبەرەکەی ئەمریان پێکردبێت، وە هەرکەسێکیش بێگوێیی خوا و پێغەمبەرەکەی بکات ئەوە کەوتووەتە سەرلێشێواویەکی ڕوون و دیارەوە، باشە دەپرسم خوا ئەمری بە هەر شتێک کردبێت لە قورئاندا بووە، ئەی پێغەمبەرەکەی لە چیدا ئەمری کردووە؟ نەنگی نییە! ئایا دەگونجێت خوای گەورە مەبەستی بە ئەمرەکەی پێغەمبەر (ﷺ)یش هەر قورئان بێت؟ دەی بۆ ناوی پێغەمبەری تێدەکات، نەشیاوە خوا مەبەست بە پێغەمبەر و خۆشی هەر قورئان بێت ئەم دووبارەکردنەوەی ناوانە بۆ؟ بە گوێی قورئان و قورئان بکەن!

ئایەتی: ﴿قَاتِلُوا الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَلَا بِالْيَوْمِ الْآخِرِ وَلَا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَلَا يَدِينُونَ دِينَ الْحَقِّ مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ حَتَّىٰ يُعْطُوا الْجِزْيَةَ عَن يَدٍ وَهُمْ صَاغِرُونَ﴾[1]، ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموویت لەگەڵ ئەوانە بجەنگن کە باوەڕیان بە خوا و بە ڕۆژی دوایی نییە، وە ئەو شتانە بە حەرام نازانن کە خوا و پێغەمبەرەکەی حەرامیان کردووە، تەماشا بکە خوای گەورە فەرمووی: ﴿مَا حَرَّمَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ﴾، تەحریم کە شێوازێکی حوکمدانە خوای گەورە دەیداتە لای خۆی و لای پێغەمبەرەکەشی، وەک وتمان بە حەرامدانانەکانی خوا لە قورئاندا بەیان کراوە، ئەی بە حەرامدانراوەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەر قورئانە! بۆیە مەلا موحەممەد چەندان ئایەتی دیکە هەن کە هەمان تێز و بیردۆزی تێدایە و ناکرێت هەر بەو سانایی و ساکارییە تەماشای بکرێت و ورد نەبینەوە لەوەی کە جۆرێکی دیکە لە دەق و سەرچاوەی حوکم هەیە کە قورئان نییە، بەڵکوو شتێکی دیکەیە

---

(1) [التوبة: ٢٩]

و هەر قورئانە لەسەرمانی واجب کردووە کە گوێڕایەڵی ببین، ئەویش پێغەمبەری خوایە (ﷺ) کە بە گوێی خۆی و ئاکار و کردەوەکانی ببین و بیکەینە ئوسوەمان لە هەموو شتێکیدا.

مەلا موحەممەد: باشە با ئەم بابەتەش کۆتایی پێ بێنین و بچینە سەر بابەتێکی دیکە.

ماجید: نا مامۆستای خۆشەویست، دەبێت بزانین کاک عەزیزیش وەک خۆمان هەمان قەناعەتی بۆ درۆست بووە، یاخود قسەیەکی ماوە کە بیکات و پرسیارێکی دەربارەی ئەمە ماوە.

عەزیز: چاوەکەم ئەوە وا وەڵامنادرێتەوە و ناکرێت بە بەڵێ و نەخێر وەڵامی بدەینەوە، وەک وتم پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەک پێغەمبەر واجبە لەسەرمان بە گوێی بکەین و ئەوەش بۆ حاڵی حەیاتی بووە، من کاتێک سەرەی خۆم هات وەڵام دەدەمەوە و قسە دەکەم ئێستا تۆ کاتی خۆتە و قسەکانت بکە و پرسیارەکانت بکە، لەوە زیاترم پێ نییە وەڵامت بدەمەوە لەسەر ئەم بابەتە، چەند بیهێنیت و بیبەیت ئەوە وەڵامی منە کە پێغەمبەر موحەممەد (ﷺ) وەک حاکم و کاربەدەستێک واجب بووە لەسەر موسڵمانان بە گوێی بکەن و ئەوەی ماوەتەوە لە قسەکانی هەمووی گومانە و کەس ناتوانێت یەقینی هەبێت کە ئەمانە قسەی پێغەمبەرن.

ماجید: کێشەکە ئەوەیە تۆ زۆر شت تێکەڵ دەکەیت و قسەی مەتاتی دەکەیت، وتمان حاکم و کاربەدەست لەگەڵ ڕەسول فەرقی هەیە، کەمێک پێش ئێستا وەڵامیمان دایەوە هەر بە قورئان و بە قورئان فەرقەکانم سەلماند، تۆش کۆمەڵێک قسە و قەناعەتی خۆتتوت و کردە ماڵ بەسەر دینەوە کە هیچی پاڵپشتی قورئانیان نییە و وات داناوە کە من بێم شوێنی قسەی بێبنەمای تۆ بکەوم، بێویژدانی ئەوەیە کە قەینا تۆ شەرحی قورئان و ئایەتم بۆ بکەیت، بانگەواز بۆ تێگەیشتنەکانی خۆت

بکەیت و هانی بدەیت شوێن تێگەیشتنەکانت بکەون، لەهەمکاتدا ئەم حەقەت لە پێغەمبەری خودا (ﷺ) سەندووەتەوە و ئەم حەقەی نادەیتێ، ئای چ زۆڵمێکە دەیکەیت، کێشە نییە با بچینە سەر پرسیارێکی تر، دواتر کە کاتی خۆت هات زۆرێک لەمانەت بۆ وەڵام دەدەینەوە.

مەلا موحەممەد: زۆر باشە کاک ماجید کۆتا قسەکانی خۆت بکە و تەنیا دە دەقەت ماوە، دواتر دەچینە لای کاک عەزیز.

ماجید: تەسەوڕکردنی دونیای قورئانی و وڵاتی قورئانی زۆر قورسە، چونکە سەدان بابەت هەیە کە قورئان قسەی تێدا نەکردووە و نازانم قورئانی چۆن حوکمیان لەسەر دەدات؟

عەزیز: بۆ نموونە چی؟

ماجید: براگیان زۆرن ئەو بابەتانەی کە قورئان بێدەنگە تیایاندا و بەیانەکەی داوەتە دەست پێغەمبەری خودا (ﷺ) بۆ تەواوکردنی، ئایەتی: ﴿مَّن يُطِعِ الرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ ۖ وَمَن تَوَلَّىٰ فَمَا أَرْسَلْنَاكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا﴾[1] چونکە بەگوێکردنی پێغەمبەریش (ﷺ) وەک بەگوێکردنی خودایە، ئەو حوکمانەی کە خوای گەورە لە قورئاندا بەیانی نەکردوون، لەڕێی پێغەمبەرەکەیەوە بەیانکراوە، سادەترین نموونە نوێژە، بەڕێزتان وەک قورئانییەک باسێکی نوێژمان بۆ بکە، چۆنیەتییەکەی و کاتەکانی و ئەوەی دەیزانی لەسەر نوێژ بۆمان باس بکە.

عەزیز: بەڕێزەکەم نوێژ قورئان زۆر بەڕوونی باسی کردووە و حوکمەکانی بەیان کردووە، بەڵام هەموو ئەوانەی سوونە بە بەڵگە دەزانن، ئەم پرسیارە دەکەن دەڵێی هەنگوینیان لە دار دا دۆزیوەتەوە، بۆ نموونە خوای گەورە ئەمر بە نوێژکردن دەکات و دەفەرمووێت: ﴿أَقِمِ الصَّلَاةَ لِدُلُوكِ

---

(1) [النساء: ٨٠]

الشَّمْسِ إِلَىٰ غَسَقِ اللَّيْلِ وَقُرْآنَ الْفَجْرِ ۖ إِنَّ قُرْآنَ الْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا﴾[1]، ئینجا قورئان زۆر بەڕوونی ئیشاراتی داوە دەربارەی نوێژ بۆ نموونە کاتەکانی وەک دەفەرمووێت: ﴿وَأَقِمِ الصَّلَاةَ طَرَفَيِ النَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ اللَّيْلِ ۚ إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ ۚ ذَٰلِكَ ذِكْرَىٰ لِلذَّاكِرِينَ﴾[2]، ئەوەتا خوای گەورە لەو ئایەتەدا زۆر بەڕوونی کاتەکانی نوێژی دیاری کردووە، ئەگەر تەماشای قورئانیش بکەین دەبینین کە رکوع و سجوود و تەواوی هەیئاتەکانی تێدا باسکردووە بەڵام جیاجیان، بۆ ئەمەش ئەگەر تەماشای قورئان بکەین، هەموو دینە ئاسمانییەکانی پێشوو هەمانە نوێژی ئێمەیان لەسەر واجب بووە، بۆیە ئەمە سوونەیەکی عەمەلی موتەواتیرە و هەموو لە هەموو وەری دەگرێت، واتە عامە لە عامەوە، بۆیە ناکرێت و ناگونجێت بوترێت قورئان لەسەری نەدواوە، بەڵکوو قورئان زۆر بەڕوونی باسی لێوەکردووە.

ماجید: باشە برا گیان ئەزیزەکەم ئەوە کەی وەڵامی پرسیارەکەی منە، نوێژ کە فەڕز کراوە لەسەر موسڵمانان نابێت لە قورئاندا باسبکرێت کە چۆن نوێژ بکەن؟ نابێت بزانن چی بڵێن لە نوێژەکەیاندا؟ چەندان پرسیاری تر، بۆیە برای بەڕێزم ناکرێت بەشتێک کە ناوتناوە سوونەی موتەواتیری عەمەلی خۆت لە وەڵامەکە بدزیتەوە، باشە سوونەی موتاواتیری عەمەلی کێ دەیکات؟ ئەم تەواتورە لە چینێکدا کە پێغەمبەری خوایە دەبێتە ئاحاد، خۆ قورەیش هەمانە ئەو نوێژەیان نەدەکرد، پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئاحادە و لەدوای ئەو تەواتوری کردووە، کەوایە دەبێت پێغەمبەر کێ فێری کردبێت؟ یان ئەو لەکوێوە هێناویەتی؟ یان پرسیارێکی ترا، ئەی من بۆ نموونە بچمە ئەفریقیا و خەڵکێک موسڵمان بکەم، چۆن فێری نوێژیان بکەم؟ بچم فەرموودەکانی چونیەتی نوێژی پێغەمبەری خوا (ﷺ)

---

(1) [الإسراء: ٧٨]

(2) [هود: ١١٤]

بخوێنمەوە بۆیان، یان سێ چوار پاس پڕ بکەم لە موسڵمان بۆ ئەوەی لەبەرچاویان سوونەیەکی موتەواتیری عەمەلی بکەین تاوەکوو فێری نوێژیان بکەین؟ بەڕاستی پێویست ناکات لەسەر هەر پرسیارێک هێندە بووەستین بۆیە ئەگەر قسەت نەماوە بابچینە سەر نموونەی دووەم، لەگەڵ ئەوەشدا پێم خۆشە ئێستا نەک باوەڕت بەوە نییە کە پێغەمبەر وەحی بۆ نەهاتووە غەیری قورئان، بەڵکوو باوەڕت هەیە کە جۆرێک لە سوونە ئێمە مولزەمین پێیەوە، ئەویش سوونەی موتەواتری عەمەلییە کە ئەمە کەمێک لەیەک نزیکبووینەتەوە و دڵنیام نزیکتریش دەکەوینەوە و خاڵە هاوبەشەکانمان زیاتر دەبێت، بۆیە ئێستا پێم خۆشە بچینە سەر چەند بابەتێکی تری فیقهی کە قورئانی تێیدا دەستەوسانە.

عەزیز: فەرمووو!

ماجید: باشە ئەوە چۆنیەتی زەکات و چەندێتی و لە چی دەدرێت وازلێدەهێنین چونکە هەر وەک نوێژەکە وایە، سوونەیەکی موتەواتیری عەمەلییە و سەلماندیشمان کە ئەوە موتەواتیر نییە، بەڵکوو ئاحادە و لە پێغەمبەرەوەیە بۆیە ئیتاعەی واجبە،هەروەها وەک ئەویش زەکات دەدەین، بەڵام با بپرسم تۆ ئامادەی پوری خێزانت بخوازیت؟ قورئان لەنێو موحەرەمات و حەرامەکاندا باسی نەکردووە!، ئامادەی خوشکی شیری و پوری شیری و خزمانی شیری خێزانت بخوازیت؟ ئامادەی خوشکی شیریت بخوازیت؟ خۆ هەموو ئەوانە قورئان لەسەری نەدواوە!

عەزیز: نەخێر ئامادە نیم، چونکە عورف لێرەدا قازییە و وەک خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿خُذِ الْعَفْوَ وَأْمُرْ بِالْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ الْجَاهِلِينَ﴾[1]، بۆیە ئەگەر عورفێک موخالیفی قورئان نەبێت کێشەی نییە، هەر بۆیە ئەگەر لەنێو خەڵکیشدا سادە ببێتەوە پوری خێزان بهێندرێت، لای منیش ئاساییە

---

(1) [الأعراف: ١٩٩]

پوری خێزانم بهێنم، وە هەموو ئەوانەی تریش کە بە شیر کراون بە خزم و کەسی من تەنیا (امهات و اخوات)ن کە قورئان باسیان دەکات ئەگینا ئەوانی تر نابنە خزم و کەسی من و بۆم هەیە ژن و ژنخوازیان لەگەڵ بکەم.

ماجید: زۆر باشە ڕەنگە بتوانیت لەمەش بە عورف خۆت بپەڕێنیتەوە، هەرچەندە دەزانی هەموو ئەو ئەحکامانە قورئان لێیان بێدەنگە و سووننەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) زۆر بەڕوونی باسی کردوون، بەڵام با پرسیارێکی ڕوونتر بکەم، بەینی خۆت و خوا کە خێزانت دەکەوێتە حەیزەوە و زەیسان دەبێت نوێژ دەکات؟

عەزیز: نەخێر نوێژ ناکات! بۆ؟

ماجید: دەی خۆ باش دەزانیت لە قورئاندا ڕەفعی حوکمی نوێژی لەسەر نەکراوە و ئەگەر سووننەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەبێت، ئەوا دەبێت خێزانت نوێژ بکات، ئەوە سووننەیە دەفەرمووێت کە نوێژ نەکات و هەتا دوای حەیزەکەش قەزای نەکاتەوە و نەیگێڕێتەوە، خۆ ئەگەر وابێت خێزانت و سەدان و هەزاران ئافرەتی موسڵمان چەندان نوێژیان ڕۆیشتووە و تاوانبارن، ناکرێت و ناگونجێت من تۆ لە هەندێک بابەتدا بەبێ بوونی فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) حوکمی شەرعی تێدا دەربکەین، چونکە هەم تاوانبار دەبین، هەم عاقیبەی فتواکانمان زەرەری زۆریان دەبێت و دەشزانیت هیچ کات ئەوە پاساو نییە کە فڵانە بابەت لە قورئاندا نەهاتووە و ئەمەی وتومە مشتێکە لە خەروارێک، سەدان بەڵگە و بابەتی فیقهی هەیە کە خوای گەورە لە قورئاندا لێیان بێدەنگە و لەڕێی پێغەمبەر (ﷺ)ەوە بەیانی کردوون، ئەوەش لە بابی تەهارەوە هەتا ئەخیر بابی فیقهی، هەمووی سەدان و بەڵکوو هەزاران نموونە هەن کە قورئان لێیان بێدەنگە، بۆ نموونە ئەو شتانەی غوسڵ واجب دەکەن؛ تەیەموم و چونیەتییەکەی، چۆنیەتی غوسڵ، حوکمی خواردنی ماسی مردارەبوو کە

قورئان مردارەوەبووی حەرام کردووە، سەدان نموونەی دیکە کە دەکرێت دواتر بە وردی باسی بکەین.

مەلا موحەممەد: کاک ماجید کاتت نەما هیچت ماوە بۆوتن؟

ماجید: تکام وایە ئاخیر پرسیار بکەم و دواتر دەبمە گوێ بۆ بیستن.

مەلا موحەممەد: فەرموو.

ماجید: باشە دەپرسم بۆ تەفسیری قورئان چی دەکەیت کاتێک تەفسیر ناکرێت ئیلا بە ڕیوایەت نەبێت.

عەزیز: قورئان زۆر ڕوونە و بە زمانێکی پاراوی عەرەبی نازڵ بووە و پێویستی بە ڕیوایات نییە بۆ تەفسیری.

ماجید: دەی با هەندێک نموونە بهێنمەوە کە ئایەتن و تەنیا ڕیوایات تەفسیری دەکەن، نموونەی ئەو ئایەتانەش زۆر زۆرن لە قورئاندا.

عەزیز: فەرموو.

ماجید: برا گیان غەیری ئەو بابەتە فیقهیانەی کە قورئان لێیان بێدەنگە، کە ئەوە دەکرێت بوترێت یەکێکە لە گەورەترین کەلێنەکانی کە لە مەنهەج و بیری قورئانییەکاندا هەیە، کەلێنێکی زۆر زانستی تریش هەیە کە ئەویش پێویستی قورئانە بۆ سووننە بۆ بەیانکردنی هەندێک ئایەت، کە تەنیا دەتوانین بە ڕیوایات بیسەلمێنین ماناکەی چییە!

عەزیز: نەخێر وەک وتم بەهیچ شێوەیەک قورئان پێویستی بە ڕوونکردنەوە نییە، قورئان خودی خۆی ﴿تِبْيَانًا لِّكُلِّ شَيْءٍ﴾[1]ە، هەروەها خوای گەورەش چەندین جار دەفەرمووێت کە قورئانێکی ڕوون و ئاشکرامان ناردووە بە زمانی عەرەبیە و ئاسانە بۆ تێگەیشتن، لە پاڵ

---

(1) [النحل:٨٩]

ئەوەشدا هەندێک ئایات پێویستی بە تەدەبور و تێفکرین هەیە تا ماناکەی ڕوون و ئاشکرا ببێت و هەندێک ئایاتی کەمیش هەن کە موتەشابیهن و ماناکەی تەنیا خودای گەورە دەیزانێت.

ماجید: نا گیانەکەم ئەوەی دەیڵێیت زۆر زانستێکی سەتحییە و ڕووکەشی زانستە، وەگەرنا قورئان هێندە ئاسان نییە، تەنیا عەرەبی بزانیت ئەوە تێبگەیت، سەدان ئایەت هەیە زانایان و پێشینی ئێمە بەجۆرێک لێی تێگەیشتوون، ئێستا مانایەک و ڕووکەشێکی تر دەبەخشێت، بۆ نموونە ئایەتی: ﴿أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَاهُمَا وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ﴾[1]، ئەگەر تەماشا بکەی زانایانی پێشوو بەجۆرێک لێی تێگەیشتوون و ئێستاش دوای نەزەرییەی (Big Bang) جۆرێک لە تێگەیشتنی تازە بۆ ئەم ئایەتە هەیە و لەهەمانکاتدا ڕووکەشی ئایەتەکەش لە ئایەتێکی سادەوە گۆڕاوە بۆ ئایەتێکی ئیعجازی و زۆر زۆریش زانستی ترە لە نەزەریەی ناسراو بە (Big Bang)، بۆیە تەفسیری ئایەت زۆر ئاوا ئاسان نییە تۆ لێی تێگەیشتووی بۆیە ئایەت پێویستی چەند بە زمان (اللغة) هەیە، ئەوەندەش بە فەرموودە و زانستی سەردەم و واقیع هەیە.

عەزیز: باشە برام ئەوە زانیمان زانستی سەردەم سوودی هەیە بۆ تەفسیری قورئان ئەی واقیع و فەرموودە بۆ؟ چۆن تەئسیریان هەیە؟

ماجید: برای بەڕێزم نموونە هەم بۆ واقیع و هەم بۆ فەرموودە کە سوودیان هەبێت بۆ فەرموودە، یاخود بڵێین تەفسیرێکی تازە بدەن بە ئایەتێکی قورئان زۆر زۆرن، بەڵام نموونەیەک بۆ واقیع و کاریگەری لەسەر ئایەتەکانی قورئان ئایەتی: ﴿وَأَعِدُّوا لَهُم مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ الْخَيْلِ

---

(1) [الأنبياء: ٣٠]

تُرْهِبُونَ بِهِ عَدُوَّ اللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ﴾[1]، {رِبَاطِ الْخَيْلِ} ئێستا واقیع گۆڕیویەتی بۆ وەسیلەیەکی تر کە ئەویش تانک و زرێپۆش و چەندان شتی ترە کە دوژمنان لێی بترسن، گەر بگەڕێین لە قورئاندا چەندان نموونەی وەها هەیە، بەڵام کاریگەری فەرموودە لەسەر قورئان زۆر زیاترە، هەندێک جار (عام)ەکانی قورئان (تخصیص) دەکات، یان (خاص)ەکانی قورئان (تعمیم) دەکات، (مطلق)ەکان (مقید) دەکات، (مقید)ەکان (مطلق) دەکات، زۆر جاریش (موبهەم) و ناڕوونییەکان ڕوون و ئاشکرا دەکات، زۆرجاریش ئەو شتانەی قورئان سکوتی لێکردوون، قسەیان تێدا دەکات.

عەزیز: دەکرێت بۆ هەریەکێک لەوانە نموونە بهێنیتەوە؟

ماجید: بەڵێ برا گیان بۆ هەموو یەکێک لەوانە نموونە دەهێنینەوە -إن شاء الله-، جارێ سەرەتا من نموونە بۆ یەکێک دەهێنمەوە و قسەی لەسەر دەکەین و پاشان دەچینە سەر یەکێکی تر، بۆ نموونە عامێکی قورئان کە فەرموودە تەخصیصی کردبێت زۆر هەن، دەکرێت بوترێت بە دەیان نموونە هەن، بەس ئەوەی کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ وَالدَّمُ وَلَحْمُ الْخِنزِيرِ وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ﴾[2]، ئەم ئایەتە زۆر بەڕوونی دوو عامی تێدایە؛ ئەویش تەحریمی مردارەبوو و خوێنە بە عامی، واتە بۆمان نییە هیچ مردارەبوویەک و هیچ خوێنێک بخۆین، تەنانەت ئەگەر ماسی و ئەگەر جگەری حەیوانیش بێت، ئایا تۆی قورئانی ماسی دەخۆیت؟ جگەری حەیوان دەخۆیت؟ خۆ ئەو ئایەتە حەرامی کردووە! چۆنە تۆ دەیخۆیت؟ خۆ عورف پێچەوانەی ئایەتە لێرەدا ئەگەر بڵێیت عورف!

عەزیز: بەڵێ دەیخۆم! بەس ئەمە نابێتە بەڵگە، چونکە خوای گەورە

---

(1) [الأنفال: ٦٠]

(2) [المائدة: ٣]

دەفەرمووێت: ﴿أُحِلَّ لَكُمْ صَيْدُ الْبَحْرِ وَطَعَامُهُ مَتَاعًا لَّكُمْ وَلِلسَّيَّارَةِ ۖ وَحُرِّمَ عَلَيْكُمْ صَيْدُ الْبَرِّ مَا دُمْتُمْ حُرُمًا ۗ وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ﴾[1]، خوای گەورە (صَيْدُ الْبَحْرِ) بۆ ئێمە حەلاڵ کردووە، هەموو خواردنەکانی نێوی دەخورێت، وە کاتێکیش دەڵێم جگەری حەیوانیش دەخۆم لەبەر ئەوەی موسەمای خوێن ئەوەیە کە خوێن بێت نەک جگەر، لەبەر ئەوەی ڕێژەیەکی زۆری خوێنی تێدایە ئیتر نەیخۆم، ئیستا کاتێک سەری حەیوانێک دەبڕدرێت خوێنەکەی کە لێی دەڕژێت حەرامە و خواردنی جایز نییە، لەبەر ئەوەی تەواوی خەڵکی پێی دەڵێت خوێن و موسەمای خوێن ئەوەیە و حەرامیشە و کەس نایخوات، بەڵام جگەر خوێن نییە بەڵکوو جگەرە، باوەڕ بکە وشەی خوێن ئەوەنە تەعمیم بکەیت دەبێت دەمارەکانی هەموو نێو گۆشتەکانیش بگەڕێیت و دەریان بهێنی هەمووی پڕن لە خوێن.

ماجید: براکەم با دوور نەڕۆین و پرسیارێک بکەم، خواردنی مردارەبوو حەرامە یان نا؟

عەزیز: بەڵێ قورئان دەفەرمووێت مردارەبوو حەرامە!

ماجید: دەی باشە ماسییەک کە مردبێت تۆ دەچی لە بازاڕ دەیکڕی، ئەوە مردارەبووە یان نا؟

عەزیز: ئاخر ئەوە ماسی ڕاوکراوە نەک مردوو، ئەگەر لەسەر دەریاییەک بووم و ماسییەکی مردوو هاتە قەراغی بەحرەکە حەرامە بیخۆم، چونکە مردارەبووە، بەڵام ڕاوکراو مردارەبوو نییە!

ماجید: ئاخر برام وردتر بپرسم بۆ ئەوەی خۆدزینەوە نەمێنێت، ڕاوی غەیری دەریا حەڵاڵە؟

عەزیز: بەڵێ!

---

(1) [المائدة: ٩٦]

ماجید: دەی من ئاسکێک ڕاو دەکەم و ئیتر سەری نابڕم!، مردارەبووە یان نا؟

عەزیز: ئممم ... بەڵێ حەتمەن.

ماجید: برا گیان دەریاش بەهەمان شێوەیە کە «صەیدی بەحر»ت بۆ حەڵاڵکراوە مەبەست پێی ئەوەیە بە زیندوویی نەک بمرێت ئەوکات بخورێت، کەوایە دەبێت ماسی بە زیندوویی سەری ببڕن ئەوکات بیخۆن و خواردنی حەڵاڵ ببێت، وەگەرنا هەموو مرادارەبوویەک داخڵی ئەو عامە دەبێت کە مردارەبوو حەرامە خواردنی!، دەی ئیتر دەبێت بزانیت ئەو عامە تەخصیص کراوە بە سوونە و ڕوونە لای من و تۆش.

عەزیز: لەم نموونە ناگەینە نەتیجە نموونەیەکی دیکە بهێنەوە!

ماجید: نموونەی تەفسیری قورئان بە سوونەت زۆرن و قورئان پێویستی بە سوونەیە بۆ ڕوونکردنەوەی هەندێک لە ماناکانی، هەندێک لەو کاریگەریانەی سوونە هەیەتی لەسەر قورئان بۆ نموونە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمْ يَلْبِسُوٓاْ إِيمَـٰنَهُم بِظُلْمٍ أُوْلَـٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلْأَمْنُ وَهُم مُّهْتَدُونَ﴾[1]، باشە هەموو زووڵمێک دەگرێتەوە؟ یان وەک ئەوەیە کە فەرمووده دەیفەرمووێت کە تەنیا شیرکە و واتای شیرک دەدات، یان ئایەتی: ﴿مِن بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِى بِهَا أَوْ دَيْنٍ﴾[2]، باشە ئەوە ئەو وەصیەیە چەندە؟ ئایا دەتوانێت هەموو ماڵەکەی بە وەسییەت دابنێت؟ یان وەک سوونە دەفەرمووێت تەنیا دەتوانێت سێیەکی ماڵەکەی بە وەسییەت دابەش بکات، یان ئایەتی: ﴿وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُوا أَيْدِيَهُمَا جَزَاءً بِمَا كَسَبَا نَكَالًا مِنَ اللَّهِ ۗ وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾[3] باشە دزیکەر چەندێکی دەستی دەبڕی

---

(1) [الأنعام: ٨٢]

(2) [النساء: ١١]

(3) [المائدة: ٣٨]

خۆ قورئان فەرموویەتی دەستیان ببڕە، دەچیت کاملی دەستیان دەبڕیت، یاخود دێیت وەک فەرمووده دەفەرمووێت دەستی ڕاستی لە مەچەکییەوە دەقرتێنیت ئەوەی لەهەردوو دەستی تەخصیص کردووە، هەر ئەمەشە کە دەکرێت بوترێت سەلمێنەری ئەو ئایەتەیە کە دەفەرمووێت: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوْمِهِ لِيُبَيِّنَ لَهُمْ ۖ فَيُضِلُّ اللَّهُ مَن يَشَاءُ وَيَهْدِي مَن يَشَاءُ ۚ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾[1]، خوای گەورە هەموو پێغەمبەرانی ناردوو بە زمانی گەلەکەیان وەحی نازڵ کردووە، تاوەکوو پێغەمبەرەکەی بە ئاسانی بۆیان ڕوون بکاتەوە، پێغەمبەر (ﷺ) بە مانای کەلیمە ڕوونکەرەوەی قورئانە.

مەلا موحەممەد: زۆرباشە، زۆر زیاتر لەکاتی خۆت قسەت کرد و ئێستا ناوبڕێک وەردەگرین و دەست دەکەینەوە بە گفتوگۆ و پرسیار ئاڕاستەی کاک عەزیز دەکەین و ئەو وەڵامدەداتەوە و دەشتوانێت هەموو جۆرە پرسیارێک لە کاک ماجید بکات.



---

(1) [إبراهيم: ٤]

## تەوەری چوارەم

## مەلا موحەممەد، کاک عەزیز دەدوێنێت

مەلا موحەممەد: کاکە عەزیز ئێستا کاتی جەنابت هاتووە، پێم خۆشە بەم پرسیارە دەست پێ بکەین کە قورئانی بۆ؟ چ دەقێکی شەرعی وابەستەی کردوویت بەو بیرۆکەیەوە؟

عەزیز: من کۆمەڵێک ئایەت دەخەمە خزمەت ئامادەبوان وەک خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿اتَّبِعْ مَا أُوحِيَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ۖ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ وَأَعْرِضْ عَنِ الْمُشْرِكِينَ﴾[1] ئەوەتا خوای گەورە دەفەرمووێت تەنیا شوێنی ئەوە بکەون کە وەک وەحی دابەزیوە، وە هەروەها دەفەرمووێت: ﴿وَهَٰذَا كِتَابٌ أَنزَلْنَاهُ مُبَارَكٌ فَاتَّبِعُوهُ وَاتَّقُوا لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾[2] ئەوەتا خوای گەورەش تەنیا کیتاب کە قورئانە بە موبارەک ناوی بردووە و داوای شوێنکەوتنی کردووە، هەروەها خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿اتَّبِعُوا مَا أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُمْ وَلَا تَتَّبِعُوا مِن دُونِهِ أَوْلِيَاءَ ۗ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ﴾[3] ئەوەتا خوای گەورە لێرەشدا داوای شوێنکەوتنی قورئان دەکات و داوا لە موسڵمانان دەکات کە تەنیا شوێنی قورئان بکەون و هەتا نەهی دەکات لە شوێنکەوتنی هەرشتێکی تر غەیری ئەو، بۆیە دەکرێت خوا شتێک بفەرمووێت و ئێمە غەیری ئەوە هەڵبژێرین، بڵێین کە نەخێر چیرۆک و ڕیوایات و ئیجتهاداتیش موقەدەسن و دەبێت بە گوێیان بکەین و وەک قورئان تەماشایان بکەین؟

---

(1) [الانعام : ١٠٦]

(2) [الانعام : ١٥٥]

(3) [الاعراف؛ ٣]

ماجید: دەکرێت وەڵامی بدەمەوە و هەندێک موغاڵەتەی مەنتیقی تێدایە ڕوونی بکەینەوە؟

عەزیز: نا، جارێ قسەکانم تەواو نەکردووە!

ماجید: نا دڵنیابە نایەڵم ئەوە تەواو بکرێت، وەک ڕێککەوتین هیچ شتێکی تازە نەوروژێنین تا وەڵامی پێشتری نەدەینەوە، بۆیە تکایە با هەموو تەوەرێک وەڵامی تەواومان بۆی هەبێت دوای ئەوە بچینە سەر بابەتێکی دیکە.

مەلا موحەممەد: فەرموو ماجید وەڵام بدەوە، کاک عەزیز مەجال بدە، چونکە خۆت بەڵێنتدا کە وابکەیت.

عەزیز: باشە فەرموو.

ماجید: برام ئێمە ڕێککەوتین هەر بابەتێک کە شێلامان و قسەمان لەسەر کرد دووبارەی نەکەینەوە، ئێمە سەلماندمان کە وەحی دیکە بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاتووە و ئەو وەحیانەش مولزیم بوون، بۆیە ناکرێت وەک ئەوەی هیچمان نەوتبێت ئێستا بچینەوە سەر قەوانە کۆنەکە، ئەو ئایەتانەی باست کردن ئەوەی کە خوای گەورە فەرموویەتی شوێن وەحی بکەون، واتە هەموو جۆرەکانی وەحی کە پێشتر باسمان کرد، بۆیە کاتێک خوای گەورە وەحی باسدەکات دەفەرمووێت شوێن غەیری وەحی مەکەون، بەس کە باسی قورئان دەکات نافەرمووێت شوێنی غەیری قورئان مەکەون، بۆیە تێکەڵکردنی ئەو ئایەتانە و پولێننەکردنیان موغالەتەیە و تەواوی ئامادەبوانیش ئەوەندە خوێنەوارن لەو موغالەتانەت تێبگەن.

عەزیز: تکام وایە بەو ئسلووبە قسە نەکرێت، هاتووین بۆ گفتوگۆ نەک قسە وتن و موهاتەرات.

مەلا موحەممەد: کاک عەزیز بڕۆرەوە سەر بابەتەکە و، «قورئانی بوون» بۆ؟

عەزیز: ئەم بەڕێزە نەیهێلا جوابی تەواوت بدەمەوە قسەکانی پێ بڕیم، تکام وایە قسەکانم بکەم و دواتر وەڵامم بداتەوە.

ماجید: فەرموو لەخزمەتتداین.

عەزیز: قورئانی بۆ؟ پرسیارێکە وەڵامەکەی کورت نییە، دەتوانم بە کتێبێک وەڵامی بدەمەوە؛ هەموو مەبادیئی خۆمی تێدا باس بکەم، بۆیە هەندێک بیرۆکە و مەبادیئی خۆم ئێستا بەیان دەکەم و دەیخەمە بەردەستتان، گرنگی قورئانی بوون و ڕەتکردنەوەی ڕیوایات و مەزاهیبتان بۆ ڕوون دەکەمەوە.

مەلا موحەممەد: فەرموو.

عەزیز: من دەمەوێت بە ڕۆشنبیری ئیسلامی بڵێم بگەڕێنەوە بۆ قورئان و هەرچی بابەتی فیکری و ڕیوایات و فەتوا هەیە بیکێشن بە قورئان و عەقڵ و زانستدا، ئەوکات پێشکەشی خەڵکی داماوی بکەن.

ماجید: ئەوەی کاکە عەزیز دەیڵێت، بەدیهیاتە و مەنهەجی زۆرینەی زانایانی ئسوڵیی و فەرموودەناسەکانە، پێوەری وەرگرتنی فەرموودە نابێت عیللەی تێدا بێت و نابێت شاز بێت، ئەمەش کەسێک بە حاڵ زانستی شەرعی بزانێت کە عیللە واتە نەخۆشی و ئەو دەقە یان ئەو فتوایە موخالەفەی عیلم و زمانی قوڕەیش و عەمەلی ئەهلی مەدینە و چی و چی بکات ئەوە مەعلولە، وە هەتا ئەگەر فەرموودەیەک دژبەیەکی هەبێت لەگەڵ -فەرموودەیەکی ئەوسەقتر لە خۆی ئەوە شازە، چما ئەگەر موخالەفەی قورئان بکات کە هەمووی موتەواتیرە بۆیە ئەو قسەیەی دەیکەیت تازە نییە، بەڵکوو زانایانی پێشین تەئصیلی شەرعیشیان بۆ کردووە و هەموویان کردووەتە پێوەری زانستی و بەردەوام کاری پێکراوە، دوای ئەمەش زیاتر وابەستەی سوننە بوون، کەوایە قورئان ببێتە پێوەر

شتێکی هەڵە نییە و پاساو نییە بۆ قورئانی بوون.

عەزیز: کوا قورئان پێوەرە؟ چەندان فەرموودەتان هەیە پێچەوانەی قورئانە و کەچی دێن مانای ئایەتەکان هەڵدەگێڕنەوە بۆ ئەوەی فەرموودەکە بەڕاست دەربچێت.

ماجید: کوا یەک نموونەمان پێ بڵێ؟

عەزیز: فەرموودەی (إِنَّ أَبِي وَأَبَاكَ فِي النَّارِ) دەی خۆ خوای گەورە دەفەرمووێت: {وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا} ئەو فەرموودەیە دژیەکە لەگەڵ ئەم ئایەتە؟ چونکە باوک و دایکی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەهلی فەترە بوون، چۆن دەکرێت پێغەمبەری خوا (ﷺ) وا بفەرمووێت کە دەزانێت ئەهلی فەترەن؟

ماجید: برام ئەو بابەتە موغاڵەتەی دونیای تێدایە، بەس پێم خۆشە بە یەک دوو پرسیار وەڵام بدەمەوە، چۆن بزانم کە ئەوکاتەی دایک و باوکی پێغەمبەر (ﷺ) ئەهلی فەترەن؟ کوا خۆ لە قورئاندا باسی ئەوکاتە نەهاتووە و مەگەر تەنیا بە ڕیوایات ئەوە بسەلمێنین و جەنابیشت خێرە لێرەدا ڕیوایەتت قبووڵە و بۆ شتی تر قبووڵت نییە!؟ ئەمە یەک، دووەم کێ ئەو ئایەتەی قەمچاندووەتەوە تا ئەو فەرموودەیە بەڕاست دابنێت؟ سێیەم بابەتێکی خیلافی لەم جۆرە هیچ شتێک ناسەلمێنێت، بە پێچەوانەوە قسەکەی من دەسەلمێنێت، چونکە زۆرێک لەوانەی ئسوڵی و فەقیهـ و فەرموودەناسن، تێبینیان هەیە لەسەر ئەو فەرموودەیە و دەڵێن موخالیفی واقیعە و مەعلولە و هیچیشیان قورئانی نین، بۆیە ئەوە پاساو نییە بۆ قورئانی بوون، بەڵگەیەک بێنەوە کە هاوکارت بێت و حاشا هەڵنەگر بێت.

عەزیز: لە جێیەکی تر خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَا عَلَّمْتُم مِّنَ الْجَوَارِحِ مُكَلِّبِينَ تُعَلِّمُونَهُنَّ مِمَّا عَلَّمَكُمُ اللَّهُ ۖ فَكُلُوا مِمَّا أَمْسَكْنَ عَلَيْكُمْ﴾[1]، دەی ئەمە دژیەکە لەگەڵ فەرموودەکەی پێغەمبەر (ﷺ) کە باسی جێ دەمی سەگ دەکات و دەبێت حەوت جار بشۆردرێتەوە.

ماجید: بە پێچەوانەوە هیچ دژیەک نین، بەڵکوو تەواوکارییەکی جوانە، ئایەتەکە باسی سەگی فێرکراو دەکات و کاتێک خوێنەری ئایەتەکە پرسیاری بۆ دروست دەبێت لەسەر ئەو سەگانەی کە فێرکراو نین، وەڵامەکەی لە فەرموودەدا دەست دەکەوێت، کە بە هیچ جۆرێک جائیز نییە، چونکە شوێن دەمەکەی بۆ قاپ و قاچاخیش پیسە و دەبێت پاکبکرێتەوە و زیانەکانی بنبڕ بکرێت، بۆیە تکام وایە بەڵگەیەک بهێنیتەوە کە فەرموودەیەک لای زانایانی ئەهلی سوونە ئیعتیباری هەبێت و لە ئەصلیشدا دژبەیەک بێت لەگەڵ قورئان.

عەزیز: جا ئێمە بێین باسی هەرچی بکەین و تۆ جوابێکی بدەیتەوە و دەست بکەیتە سەفسەتە ناگەینە هیچ ئەنجامێک، بۆیە بهێڵە با قسەکانم بکەم و دواتر مایک بەجێ بهێڵم بۆ وەڵامەکانت.

ماجید: تکام وایە ئەو مەنهەجییەتە جوانەی سەرەتا لەسەری ڕۆشتووین تێکی نەدەین، چونکە من لەکاتەکانی خۆم مەجالی تەواوم داوە پێت کە وەڵام بدەیتەوە، بەس بەداخەوە ئێستا تۆ دەتەوێت قسە بکەیت بەبێ ئەوەی بمکەیتە شەریکی قسەکانت، بەڵام دەشێت هەندێک قسە بکەیت و من وەڵامنەدەمەوە وەڵامەکان تاخیر بکەم.

مەلا موحەممەد: ئەو یاسا و ڕێسایانەی لەسەری ڕێککەوتووین، هەر لەسەر ئەوە دەڕۆین، بۆیە هەرکات ویستت وەڵام بدەیتەوە بەشداری بکە، فەرموو کاک عەزیز قسەکانت بکە.

---

(1) [المائدة: ٤]

عەزیز: کێشەکە ئەوەیە ئەم قورئانە کە هەموو ئوممەت قبووڵیانە و بیهێنیتە ڕیزی فەرموودە کە هەمووی لەسەر گومان بونیات نراوە، چەندان ساڵ دوای پێغەمبەر (ﷺ) نوسراوەتەوە نازانرێت ڕاستە یاخود نا!

ماجید: بەڕێزم زۆر سەیرە کە بەڕێزتان بەبێ ئاگایی، سوونە سەرچاوەیەکی گرنگە لە قسەکانتدا؟

عەزیز: شتێک مەدە پاڵ من کە نەموتبێت.

ماجید: ئەوەتا تۆ دەڵێیت فەرموودە چەندان ساڵ دوای پێغەمبەر (ﷺ) نووسراوەتەوە، دان دەنێیت بە هەموو ئەو ڕیوایەتانەی باسی کۆکردنەوەی فەرموودە دەکەن، چۆن دەزانیت کە بوخاری و موسلیم لەسەردەمی پێغەمبەر (ﷺ)دا نەبوون؟ چۆن دەزانیێت لەگەڵ قورئان فەرموودە نەنووسراوەتەوە؟ چۆن دەزانیت هەمان ئەو کەسانەی کە قورئانیان نووسییەوە هەمان ئەو کەسانە نین کە فەرموودەیان نووسیوەتەوە؟ سەدان پرسیاری دیکە، عەزیزەکەم هەرچەند ڕابکەیت و بێیت و بڕۆیت، هەر دەبێت بەشێک لە قسە و وتارت ڕیوایات بێت، چونکە وێنا ناکرێت دونیایەک بێ ڕیوایات و کەلامییەکانی زووش هەر ڕیوایاتیان بەکار دەهێنا و بەشێک بووە لە فتوا و بیردۆزەکانیان.

عەزیز: ئەم ماجیدە زۆر هەوڵی شکاندن و بێڕیزی دەدات و ناکرێت موناقەشە بەمجۆرە.

مەلا موحەممەد: ئەگەر قسەیەکت ماوە کاک عەزیز بیکە و ئەگەر نەتماوە با کۆتایی بەم تەوەرەیەش بهێنین.

عەزیز: بەڵێ قسەم ماوە، بەس وەک وتم قسەکان دەکەم و با پێم نەبڕدرێت، تا تەواوی دەکەم قسەم پێ نەبڕدرێت، زۆر بە ڕاشکاوانە دەیڵێم؛ لەوەتەی مرۆڤایەتی پێشکەوتووە و عەقڵ و مافەکان گەشەیان

کردووه ئوممەتی ئیسلامی لە دژیەکی و تەناقوزدا دەژیێت، خوێنەواران و ڕۆشنبیرانی ئوممەت ئاگاداری ئەو بەریەککەوتنەی زانست و عەقڵە دەکەن لەگەڵ ڕیوایەتەکان، بەڵام لەترسی دۆگمایی گەلێکی بە مەڕ کراو ناوێرن بڵێن ئەم وێرانەیە پێشینان و ڕیوایات بۆیان بەجێ هێشتووین، ئەوەی لەدوای ڕیوایاتەوە لەدایک بووە جیلێکی شێواو و دۆگمان داڕوخاون لە هەموو ڕوویەکەوە، ئوممەتێکن کە بەکەڵکی خۆیان و ئوممەتانی تری جیهان نایەن، نەگبەتی ئەم ئوممەتە لەوێوە دەستی پێکرد؛ کە بنەما نەگۆڕەکانی قورئان کرانە قوربانی قسەی دەماودەمی ئەم و ئەو، کاتێک پێغەمبەری خوا (ﷺ) شیکاری بۆ ئایەتگەلێک دەکرد تەنیا بۆ کات و سەردەمی خۆی بووە و بۆ کات و ساتێکی تایبەتی کردووە نەک بۆ هەمووکاتەکان، ئێستا ئێمە لەبەردەم دوو سەرچاوە داین، سەرچاوەیەکی ئەبەدی و بێسنوور، سەرچاوەیەکی کاتی و سنووردار، دەبێت حساب بۆ ئەوە بکەین ئەو سەرچاوە کاتی و سنوورداره بە تێپەڕبوونی زەمەن و دەرچوون لە ناوچەیەکی دیاریکراو سوودی نامێنێت و ئێکس پایەر دەبێت.

ماجید: چۆن دەکرێت ئەو هەمووە قسەی کردووە کە هەر فریای نووسینەوەی ناکەوم بەبێ وەڵام بڕوات؟

عەزیز: بوەستە تەواو نەبووم.

ماجید: ڕاستە تەواو نەبوویت و چاوەڕێت دەکەین تا تەواو دەبیت بەس وەک پێشتر ڕێک کەوتین دەبێت مەجالی وەڵامدانەوە بدەیتەوە.

مەلا موحەممەد: فەرموو ماجید وەڵامی بدەوە.

عەزیز: من ئەم کۆڕ و سیمینارە جێ دەهێڵم و لە شوێنێک دانانیشم کە ئیحتیرامی ڕامانی تێدا نەگیرێت، چونکە من نیوسەعاتە دەڵێم بهێڵن با قسەکانم تەواو بکەم و دواتر وەڵامم بدەنەوە، چونکە سەدان و هەزاران

فەرمووده هەیە موخالیفی قورئانە و ئێوە بە سەحیحی دادەنێن هێشتا باسی هیچکامیانمان نەکردووە، سەدان پرسیار و گومانی زانستی هەیە کە هێشتا مەجال نەدراوە بە من باسی بکەم، تا ئێستا وەک گوێگرێکی موحتەرەم دانیشتووم و لەگەڵتان گوێدەگرم و قسەم نەکردووە.

مەلا موحەممەد: کاک عەزیز دانیشتنت لەم گفتوگۆیەدا نیشانەی نەپسان و زانستی بوونتە و بۆیە دەکرێت تا کۆتایی دابنیشیت و هەرچی هەیە شەن و کەوی بکەین و بیخەینە بەر باس و هیچ بابەتێک جێ نەهێلین بێ وەڵامدانەوە، بۆیە با کات بدەینە کاک ماجید وەڵام بداتەوە و دواتر گەر بتانەوێت تەوەری بابەتەکان دەگۆڕین بەو جۆرەی تۆ دەتەوێت، فەرموو کاک ماجید چیت پێیە بیڵێ!

ماجید: بەڕێزان کاک عەزیز وتی بە ڕاشکاوانە هەموو دواکەوتنی ئێمە ڕیوایاتە! ئەی گرۆی بەناو قورئانییەکان کە ڕیوایاتیان لا نییە و قەناعەتیان نییە کوا ئەنیشتاین و ئەدیسۆنەکانیان، نا واز لە ئەنشتاین و ئەدیسۆن بێنە، قورئانییەکان کوا ابن حەجەر و ئیبن تەیمییە و دارەقوتنی و زاناکانیان، ئەوانەی وازیان لە ڕیوایات هێناوە کوا ناویان کوا داهێنانیان، تەواوی جیلی دوای ڕیوایاتی بە سەرلێشێواو و دۆگما لە قەڵەم دەدات کە ئەمە عەیبەیە، چونکە هەرە عەزیمەکانی ئێمە کە نەک خۆمان ئەورووپی و داهێنەرەکانی ژیان شانازیان پێوە دەکەن لەو جیلەن کە دوای ڕیوایات هاتوون کە ئەم بەدۆگمایان دەزانێت، وەک ئیبن حەییان خەواریزمی و عەباسی کوڕی فەرناس و کێ و کێی تر، چ بێویژدانییەکە هەموو دونیا بە چەپ و ڕاستییەوە ئیسلام و موسڵمانان بەسەرچاوەی سەدان داهێنراو دەبینن، کەچی ئەم بەڕێزە هاتووە بەو جیلە دەڵێت دۆگما و سەرلێ شێواو، سەرەڕای ئەمانەش هاتووە خیانەت دەداتە پاڵ سەداسەدی زانایان و دەڵێت هەموویان زانیویانە کە ڕیوایات بەریەککەوتنی هەیە

لەگەڵ قورئان، بەس لە ترسی میللەتی مەڕ ناوێرن بیڵێن، کە ئەم قسەیە هەم قسە وتنە بە موسڵمانان و کۆمەڵگە هەمیش بوختانە بەرانبەر زانایان کە ترسنۆک و خائین بوون، چەندان قسەی تریشی کرد، کە هەر سەرەتا وەڵامم دانەوە و بەس دووبارە دەیەوێت لەسەری بڕوات و دووبارەی بکاتەوە تا خەڵکی باوەڕی پێدەکەن، بۆیە خۆشحاڵم کە دەیەوێت واز لەو قسە مەتاتیانە بهێنێت و دەست بکاتە تەوەرێک کە من خوازیارم بیکاتەوە، ئەویش ئەو فەرموودانەن کە سەحیحن و موخالفی قورئان و گوایە چەندان گومانی زانستی و عیلمی لەلایە، بۆیە من خۆم داواکارم مایکی تەسلیم بکەین و چی لایە لەو بابەتانە با دەست پێ بکات، بەڵام دەبێت ئەوەمان بیر نەچێت کە لە سەرەتاوە قسەمان لەسەر کردووە و بڕاندوومانەتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەحی دیکەی بۆ هاتووە غەیری قورئان و ئەو وەحیانەش مولزیم بوون و پێغەمبەری خوا (ﷺ) موشەریع بووە بۆمان، دەی کەوایە من ئامادەم تەوەرەکە بگۆڕدرێت.

مەلا موحەممەد: کەوایە کەمێک ئیسراحەت دەکەین و تەوەرێکی دیکە دەکەینەوە کە کاک عەزیز پرسیار دەکات و کاک ماجید وەڵام دەداتەوە و هەموو ئەو شک و گومانانە هەیە دەرهەق بە فەرموودە دەوروژێنرێت، باسی دەکەین.

## تەوەری پێنجەم:
## کاک عەزیز هەرچی پرسیار و گومانی هەیە دەیروژێنێت

مەلا موحەممەد: خۆشەویستان دوای ئەو پشوە کورتە خۆشحاڵین دێینەوە خزمەتتان، وەک دەزانن لە تەوەری یەکەمدا کاک ماجیدم دواند و لە تەوەری دووەمدا کاک عەزیزم دواند و ئێستا کە ویستمان کۆتایی بە دیبەیت و گفتوگۆکە بهێنین، کاک ماجید پێشنیاری کرد کە تەوەرێکی تر زیاد بکەین ئەویش ئەوەیە کە هەرچ پرسیارێک هەیە لەمەڕ فەرموودە و ڕیوایات بکرێت و وەکوو پێویست وەڵام بدرێتەوە، بۆیە من مایک بەجێ دەهێڵم بۆ کاک عەزیز پرسیارەکانی بکات و کاک ماجید وەڵامەکان بداتەوە، تەنیا کاتی پێویست من بەشداری دەکەم، فەرموو کاک عەزیز.

ماجید: ببورە مەلا موحەممەدی خۆشەویست بەس بەم جۆرە ناکرێت، وەک چۆن ڕێسا و یاسای زانستیمان دانا بۆ هەموو قسەکانمان ئێستاش دەبێت دایبنێینەوە.

مەلا موحەممەد: فەرموو بۆ نموونە چ ڕێسایەک.

عەزیز: یاسا و ڕێسای بۆ چییە؟ پرسیار دەکەم و وەڵامی دەدەیتەوە!

ماجید: ڕاستە تۆ پرسیار دەکەیت و من وەڵام دەدەمەوە، بەڵام چی بکەینە خاڵی یەکلایی کردنەوەی وەڵامەکانمان؟ کێ ببێتە حەکەمی نێوانمان؟ چی بکەینە خاڵی یەکلایی کردنەوەی دژیەکەکان؟ تا چەند پرسیار بۆت هەیە بیکەیت؟ خۆ ئەگەر ئەو هەمووە فەرموودەیە بهێنیت و یەک یەک وەڵام بدرێتەوە کاتمان هیچ نامێنێت.

مەلا موحەممەد: باشە کاک ماجید چی دادەنێیت وەک ڕێسا و یاسا قبووڵکراوە، چونکە حەقی پرسیار کردنمان داوەتە کاک عەزیز و حەقی یاسا و ڕێساکانیش بۆ تۆ.

ماجید: سەرەتا مەلا موحەممەد تۆ حەکەمی نێوانمان بە، لەهەرشوێنێک وەڵامەکانم بەهێزنەبوو دەتوانیت پێش کاک عەزیز ڕەتی بکەیتەوە و بڵێی موقنیع نییە، دووەم بەڕاستی کاتێک فەرموودەیەک دەکاتە دژیەک لەگەڵ قورئان دەبێت ئیحتیمالی دیکە هەڵنەگرێت چونکە هەمووومان دەزانین (الدليل إذا تطرق إليه الاحتمال سقط به الاستدلال) بۆیە ئەگەر ئیحتیمالێکی دیکە هەڵگرێت شایەنی ئەوە نییە وەک بەڵگە بیهێنێتەوە، سێیەم ئەم پیاوە نابێت مەجال لەبەردەمیدا کراوەبێت چی پێی خۆشە بپرسێت، دەبێت تەنیا دە پرسیار زیاتر نەکات و هەموو ئەو پرسیارانەی بە یەکلایی کردنەوەی بابەتەکەی دەزانێت بیکات، واز لە هەندێک پرسیاری سادە بهێنێت کە لەبەردەمماندا هەیە و سەدان وەڵامی لە گۆگڵ و سایتەکانی دیکە دەستمان دەکەوێت.

عەزیز: زۆر باشە سەرەتا بۆ ئەوەی وێنەکە دروست بکەم بۆ پرسیارەکانم ئەم پێشەکییە دەخەمە خزمەتتان، فەرموودە قورئان نەبووە تا ئەصحاب بینووسنەوە و پارێزگاری لێ بکەن، هەتا پێغەمبەری خواش (ﷺ) فەرمانی کردووە بەوەی کە نەنووسرێتەوە، دواتر دوای زیاتر لە سەد ساڵ کەسێک دێت ئەم فەرموودانە کۆدەکاتەوە و کۆمەڵێک ڕیسا و یاسا دادەنێت بۆ کۆکردنەوەکە، بەڵام ئەوەیان بیرچووە کە قسە زوو بیردەچێتەوە و بیریش نەچێتەوە هەرگیز ناتوانرێت وەک جاران بووترێتەوە، بۆیە هەرگیز ناتوانرێت بەو کتێبانە بوترێت قسەی پێغەمبەر (ﷺ)، ئەگەر من و تۆش لەسەر ئەوە ڕێککەوتبین کە پێغەمبەر (ﷺ) وەحی دیکەی بۆ هاتبێت و ئەو وەحییانەش مولزەم بوو بن کێشە نابێت، بەڵام چۆن بۆم دەسەلمێنیت کە ئەو کتێبانە قسەی پێغەمبەری خوان (ﷺ)؟

ماجید: سەرەتا ڕێککەوتین کە تەنیا ئەو فەرموودانە بهێنیتەوە کە دژیەکن لەگەڵ قورئان، بەڵام هاتیت کۆمەڵێک شتت وروژاند کە پێم خۆشە وەڵام بدرێنەوە، سەرەتا وتت کە فەرموودە وەک قورئان نەبووە و ئەصحاب نەیان نووسیوەتەوە و هەتا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی کردووە نەنووسرێتەوە، جا ئەمە زۆر موشکیلەیە بۆ تۆ؟ پێم ناڵێیت چۆن زانیت کە فەرموودە نەنوسراوەتەوە! ئایا قورئان وتویەتی؟ یان ئەویشت لە قورئان وەرگرتووە؟ یان چۆن زانیت پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی کردووە نەنووسرێتەوە؟ قورئان باسی کردووە یان ئەویش هەر فەرموودە؟ پرسیار لە خۆت ناکەیت بۆ باوەڕت بە هەندێک لە فەرموودەکان هەیە و دەیکەیتە بەڵگە و باوەڕت بەوی دیکەی نییە، دواتر ئەم قسانەی کردیشت وەها نییە بەڵکوو چەندان بەڵگە هەیە لەسەر ئەوەی کە ئەصحاب فەرموودەیان نووسیوەتەوە و دیارترینیشیان ئیمامی عەلی و عەبدوڵای کوڕی ئیمام عومەر و جابری کوڕی سەمرە بوون، کە ئەگەر کەمێک ئاگاداری مێژوو بین پێچەوانەی قسەکەت دەبینین، وە فەرمانی پێغەمبەری خواش (ﷺ) بەڵێ هەیە و فەرمانی کردووە نەینوسن، بەڵام دەبێت بزانیت کە (عام) و (خاص) هەیە (موتڵەق) و (موقەیەد) هەیە (عام) و (شاز) هەیە، ئەو فەرموودەیە بۆ عامەی خەڵک بوو، چونکە سەرەتای وەحی بوو نەک عامەی خەڵک قورئان و فەرموودە تێکەڵی یەک بکەن و جیای نەکەنەوە، بەڵام ئەم ڕێگریە بۆ ئەو هاوەڵانە نەبوو کە زیرەک بوون و قورئان و سوونەیان لێک جیا دەکردەوە، چونکە هەر لەو سەردەمەدا دەیان هاوەڵ هەبوون دەیاننووسییەوە، پاشان هاتوویت دەڵێیت کەسانێک هاتوون سەد ساڵ دوای ئەوە نوسیوویانەتەوە و بێئاگا بوون لەوەی کە ئەم فەرموودانە بیردەچنەوە، ئاخر کاک عەزیز ئەمە بەدیهیاتە و خۆ خڵافاندنە لەو واقیعەی تێیداین، کاکە با واز لە بوخاری و موسلیم بهێنین کە گوایە دوای سەدساڵ زیاتر لە وەفاتی پێغەمبەر (ﷺ) نووسراونەتەوە، وەرە با من و تۆ موەتەئی ئیمام

مالیک بکەینە حەکەممان، خۆ ئەوە لەدوای سەد ساڵ نەنوسراوەتەوە، بەڵکوو ڕێک لە زەمەنی ئەصحاب و لەنێو ئەصحابدا نوسراوەتەوە، ئەگەر موشکیلەت ئەو سەدساڵەیە دەی ئەوە بۆم چارەسەر کردی، بۆ زانیاریشت قسەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بیر ناچێتەوە ئەوە بۆ کاری ڕۆژانە بەکاردەهاتن ویردی سەرزاری خەڵکی بوو، مەجالیشی زانایان و خوێنەواران بەردەوام لەسەر ئەو فەرموودانە بووە، هەر دوای وەفاتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) مامەڵەی تەندروستیان لەگەڵ فەرموودە دەکرد وەک ئەو مامەڵەیەی ئیمامی عومەر لەگەڵ ئەبو موسای ئەشعەری لەکاتی دانی لە دەرگاکە و وتنی فەرموودەکە، ئیمامی عومەر داوای شاهێدی لێکرد کە بزانرێت پێغەمبەر (ﷺ) ئەو فەرموودەیەی فەرمووە، وە چەندان مامەڵەی دیکە کە ئێستا بوونەتە مەنهەج بۆ شێوازی مامەڵەکردن لەگەڵ فەرموودە، بۆیە بەمە دەسەلمێت کێشەی ئێوە لەگەڵ خودی فەرموودەیە نەک ئەوەی سەدساڵە یان هەزار ساڵ دواتر نوسراوە، بۆیە تکایە پرسیارێک بکە جەوهەری بێت و بزانرێت کێشەکەی تۆ لەسەر ئەوەیە، سەرەڕای ئەوەش پێم خۆش نەبووە دووبارەی بکەمەوە کە هەمدیسان تۆ دێیت کۆمەڵێک قسەی مێژوویی دەکەیت کە هەر بە فەرموودە نوسراوەتەوە و چوزانیت کە فەرموودە پەنجا یان سەدساڵ دوای پێغەمبەر (ﷺ) نوسراوەتەوە ئەگەر بە فەرموودە نەبێت؟ کێ دەڵێت بوخاری و موسلیم هاوەڵی پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەبوون!، بۆیە تکام وایە پرسیارێک بکەیت لەبەرژەوەندیتدا بێت و واش بکات زوو ئەم گفتوگۆیە بە پایان بگەیەنین.

عەزیز: برام وەک وتم ئەوە وەک پێشەکی بۆ دروستکردنی وێنای سەرەتای پرسیارەکانم دامنا وەگەر پرسیارەکانم ئەمانە نین.

ماجید: برای من ئەو پێشەکییە هەڵەیە و بینا و وێنای لەسەر دروست ناکرێت.

عەزیز: بەهەرحاڵ نامەوێت کات بەم سەفسەتانەتەوە بکوژم، بۆیە بە فەرموودەیەکی بوخاری دەست پێدەکەم کە دەڵێت گوایە پێغەمبەر (ﷺ) سیحری لێکراوە و بەردەوام لەگەڵی بووە و هەتا پێش وەفاتیشی ئەو سیحرەی لەگەڵدا ماوە، دەی ئەمە موخالیفی ئایەتەکانی قورئانە و خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَاللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ﴾، هەروەها دەفەرمووێت: ﴿وَقَالَ الظَّالِمُونَ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا رَجُلًا مَّسْحُورًا﴾ هەروەها دەفەرمووێت ﴿إِذْ يَقُولُ الظَّالِمُونَ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا رَجُلًا مَّسْحُورًا﴾ ئەوەتا خوای گەورە بەڵێنی پاراستنی پێغەمبەر (ﷺ)ی داوە و دواتریش لە چەند شوێنێکدا زەمی ئەوانە دەکات کە بە پێغەمبەر (ﷺ) دەڵێن سیحری لێکراوە و بە زاڵم ناویان دەبات، کەچی بێئاگا لەو ئایەتە بوخاری هاتووە سیحری داوەتە پاڵ پێغەمبەری خوا (ﷺ) و بە سیحر لێکراو ناوی دەبات.

ماجید: بابەتی سیحر لێکراوی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بابەتێکە مقۆمقۆی زۆری لەسەرە و زانایان شەن و کەوی تەواویان کردووە و ئێستا خەڵکانێک دێن گەرمی دەکەنەوە و بە تازە دەیدەنەوە پێمان، بەس نازانم کاک عەزیز ئەمەی لە کوێ هێنا کە بوخاری قەناعەتی وابووە کە ماوەیەکی زۆر ئەو سیحرەی لەگەڵ بووە و لەکاتی وەفاتیشیدا هەر لەگەڵی بووە! ئەگەر بچیتە خزمەت فەرموودەکە هیچکام لەمانەی تێدا نییە، بۆیە نامەوێت کات بەوانەوە بکوژم و لە درێژدادریشدا وەڵامەکان ون بکەم، دەمەوێت پێش وەڵامدانەوە پرسیارەکەت تێکبشکێنم، سیحرلێکرانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر دەربچێت موخالیفی قورئانە ئەوە بێ چەن و چوون ڕەفزی دەکەین، ئەگەر لەنێوان بوخاری و موسلیمیشدا ئیتفاقی لەسەر کرابێت و هەردووکیان بە یەک لەفز و کەلیمات و سەنەد هێنابێتیان، چونکە ئێمە فەرموودەیەک ئەگەر موخالەفەی ئەوسەقتر لە خۆی بکات تەزعیفی دەکەین، چ جای ئەوەی کە موخالەفەی قورئان بکات، بەڵام ئەگەر دوو دەق دژیەک بوون و توانرا تەوفیق بخرێتە نێوانیان ئەوە کار

بە هەردوو دەقەکە دەکرێت و دژیەکە زاهیرییەکەیان تەفسیر دەکرێت و دەڕوێنرێتەوە، بۆیە ئەم فەرموودەیە سەدان شاکار و وەڵامی جوانی دراوەتەوە و تەوفیق خراوەتە نێوان ئەو ئایەتانە و ئەو فەرموودەیەی بوخاری، سەرەتا دەبێت بزانین ئایا دەکرێت و دەشێت سیحر لە پێغەمبەران بکرێت؟ بەڵێ دەگونجێت سیحر لە پێغەمبەران بکرێت و ئەویش جۆرێکە لە سیحر کە تەخەیولییە و خەیاڵیان بۆ دروست دەکات وەک چۆن لە سوورەتی (طه)دا هاتووە کە پێغەمبەر مووسا سیحری تەخەیولی بۆ دروست بووە ﴿فَإِذَا حِبَالُهُمْ وَعِصِيُّهُمْ يُخَيَّلُ إِلَيْهِ مِن سِحْرِهِمْ أَنَّهَا تَسْعَىٰ﴾ ئەگەر سەیری ئەو ئایەتە و فەرموودەکەش بکەین یەک لەفزە و یەک جۆر سیحرە «سُحِرَ النبيُّ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ، حتَّى كانَ يُخَيَّلُ إلَيْهِ أنَّه يَفْعَلُ الشَّيْءَ وما يَفْعَلُهُ، حتَّى كانَ ذَاتَ يَومٍ دَعَا ودَعَا» بۆیە دەشێت ئەو جۆرە سیحرە لە پێغەمبەران بکرێت، دووەم بۆ ئەوەی کە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَاللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ﴾ بەڵێ خوا پاراستی لە هەموو کەس و دڵنیایی خوا بوو بۆ پێغەمبەر (ﷺ) کە ناکوژرێت، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە کە نەخۆش نەکەوێت، یان ئازار و عەزیەتی نەدرێت، یان بریندار نەکرێت، بە پێچەوانەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەک هەموو مرۆڤێک نەخۆش دەکەوت و برسی دەبوو ئازاری پێدەگەشت و ئازار دەدرا، ئەگەر ئەو ئایەتە بە مانا عاممەکەی تەماشای بکەین و تەخصیصی نەکەین بۆ

---

(1) روى البخاري في صحيحه عن عائشة رضي الله عنها أن رجلا من بني زريق يقال له لبيد بن الأعصم سحر رسول الله (ﷺ) حتى كان رسول الله (ﷺ) يخيل إليه أنه كان يفعل الشيء وما يفعله حتى إذا كان ذات يوم أو ذات ليلة وهو عندي، لكنه دعا ودعا ثم قال: يا عائشة أشعرت أن الله أفتاني فيما استفتيه فيه؟ أتاني رجلان فقعد أحدهما على رأسي والآخر عند رجلي، فقال أحدهما لصاحبه: ما وجع الرجل: فقال: مطبوب، قال: من طبه؟ قال: لبيد بن الأعصم، قال في أي شيء قال: في مشط ومشاطة وجف طلعة نخل ذكر، قال وأين هو؟ قال: في بئر ذروان فأتاه رسول الله (ﷺ) في ناس من أصحابه فجاء فقال: يا عائشة كان مائها نقاعة الحناء وكان رؤوس نخلها رؤوس الشياطين.

کوشتن و کوژران و حیفزی وەحی، ئەوە دەبێت حادیسەی ئیفک و تاوانە گەورەکە کە قورئان باسی دەکات ڕەت بکەینەوە و یان ئەو ئایەتانەی باسی ئازاردانی پێغەمبەر (ﷺ) دەکات ڕەت بکەینەوە، یان ئەوەی کە عوقبە شیاکە و ڕیخی ئاژەڵ دەکات بەسەری پێغەمبەر (ﷺ)دا لەکاتی نوێژدا، یان ئەوەی ئەبو لەهەب و خێزانی یان برینداربوونی لە جەنگی ئوحوددا و چەندانی تر، بۆیە ئەو ئایەتە بەو شێوە گشتگیرییە نییە و نابێتە بەڵگە بۆ بابەتەکەت، پاشان ئەوەی قورئان هەموو ئەوانە بە کافر ناودەبات کە بە پێغەمبەر (ﷺ) دەڵێن سیحر لێکراوە، ئەمە موعادەلەیەکی ئاسانە، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَلَمَّا جَاءَهُمُ الْحَقُّ مِنْ عِنْدِنَا قَالُوا لَوْلَا أُوتِيَ مِثْلَ مَا أُوتِيَ مُوسَى أَوَلَمْ يَكْفُرُوا بِمَا أُوتِيَ مُوسَى مِنْ قَبْلُ قَالُوا سِحْرَانِ تَظَاهَرَا وَقَالُوا إِنَّا بِكُلٍّ كَافِرُونَ﴾ ئەوەتا لێرەدا بە وازحی بەنی ئیسرائیل تەوراتی موسا پێغەمبەر بە سیحر ناو دەبەن وەک چۆن زاڵمەکانی سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) قورئان بە سیحر ناو دەبەن، ئەوەتا خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿قَالُوا سِحْرَانِ تَظَاهَرَا﴾ ئەوەتا ئەو شوبهەیەی کە قورئان و تەوراتیان پێ سیحرە ڕەفزدەکاتەوە، بۆیە نە مووسا و نە پێغەمبەری خۆمان (ﷺ) سیحر لێکراو نین و ئەوەی هێناویانە سیحر نییە، بەڵام دەشێت سیحری تەخەیولیان لێ بکرێت وەک چۆن خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿يُخَيَّلُ إِلَيْهِ مِن سِحْرِهِمْ أَنَّهَا تَسْعَىٰ﴾ وە لە فەرموودەکەی بوخاریشدا هاتووە کە دەفەرمووێت: «لَيُخَيَّلُ إِلَيْهِ أَنَّه يَفْعَلُ الشَّيْءَ وما فَعَلَهُ»، سەرەڕای هەموو ئەم وەڵامانەش لێت ناشارمەوە چەندان زانای گەورەی ئوممەت هەبوون باوەڕیان بەم فەرموودەیە نەبووە و بە زەعیفیان داناوە و بە مەنهەجێکی زانستی خۆیان ڕەتیان کردووەتەوە و لە هەمان کاتدا نەبوونەتە قورئانی و هەموو فەرموودە ڕەت بکەنەوە، بەڵکوو بە پێچەوانەوە بۆ دیفاعیان لە سووننە ئەو فەرموودەیە ڕەت دەکەنەوە، لەوانەش تاهیر بن عاشوور و ئەبوبەکری جەصاص و فەخری ڕازی و موحەممەد عەبدۆ و سەید قوتب و چەندانی

دیکە، ئەم فەرموودەیان بە زەعیف داناوە، کۆی بەڵگەکانیشیان ئەوەیە کە دەڵێن ئەم حادیسەی سیحرە غەریبە و ئینفرادی تێدایە کە هیشام لە عوروە و ئەویش لە دایکمان عائیشە دەگێڕێتەوە، هەیانە دەڵێت ئەم بابەتە مولحیدەکان هێناویانەتە نێو کتێبەکانمان و چەندان قسەی دیکە، بۆیە پاش ئەو تەوفیقەی بۆم باسکردیت، هیچ کێشەیەک نابینین فەرموودەیەک یان سەد فەرموودە لەنێو بوخاریدا پێی بوترێت زەعیفە لەبەر ئەوەی موخالفە لەگەڵ قورئان، چونکە ئەوە ئیتفاقی هەموو ئەهلی حەدیسی لەسەرە کە ئەگەر فەرموودەیەک موخالیف بێت بە قورئان، یان بە فەرموودەیەکی ڕاستتر لە خۆی، ئەوە ئەو فەرموودەیە ڕەت دەکرێتەوە و کاری پێناکرێت.

عەزیز: ئاخر هەموو کەس ئەو قسەیە ناکات و سەدا نەوەتی موسڵمانان باوەڕیان بەو فەرموودەیە هەیە.

ماجید: دەی برای بەڕێزم منیش قسەی سەدا نەوەتەکەم بۆ هێنایت کە چەند زانستییە و تەنیا بە قورئانیش بابەتەکەم سەلماند کە قورئان پشتگیریانە و سەدا دەیەکەشم باسکرد کە بە زەعیفی دەزانن هەموو بەڵگەکانیشیانم باسکرد، بۆیە هەردوو ڕایەکە هەیە و زەعیف بوون یان صەحیح بوونی فەرموودەکە پاڵنەر نییە بۆ قورئانی بوون و وازهێنان لە سوننەت.

عەزیز: بەم جۆرە ناگەینە ئەنجام تۆ بێیت بۆ هەموو پرسیارێکی من چەند ڕایەک بێنیت و عەرزی بکەیت و دواتر لە پرسیارەکە ڕابکەیت، منیش بیرم نامێنێت چ پرسیارێکم کردووە، بۆیە کە من فەرموودەیەک دێنم و دەیسەلمێنم دژی قورئانە بڕۆ سەر ئەسڵی بابەتەکە و بیسەلمێنە کە دژی قورئان نییە.

ماجید: دەی برای بەڕێزم، منیش ڕێک وەهام کرد هەموو ئایەتەکانم هێنایەوە کە قورئان نەفی سیحر لە موسا و موحەممەد (ﷺ) دەکات،

دەشفەرمووێت نە قورئان سیحرە و نە تەورات، بەڵام سیحری تەخەیولی دەداتە پاڵ موسا و ئەوە ئاساییە و ڕەبتی بە پەیامەکەوە نییە، جۆرێکە لە نەخۆشی و وەسوەسە بۆیە تەنیا بە قورئان وەڵامم دایەوە و یەک فەرموودەم باس نەکرد.

عەزیز: بەهەرحاڵ ئێمە دژایەتی فەرموودە ناکەین لەبەر ئەوەی فەرموودەیە، بەڵکوو زۆرێک لەو فەرموودانە نەک موخالەفەی قورئان دەکەن بەڵکوو موخالەفەی زانستی سەردەم دەکەن و عیلم پێچەوانەی ئەوە دەسەلمێنێت.

ماجید: جارێ با نەچینە سەر ئەوەی کە ئایا موخالەفەی زانستی تەجریبی دەکات یاخود نا، با ئەمە تەواو بکەین کە ئایا موخالەفەری قورئان دەکات یاخود نا، بۆ زانیاریی و وەبیرهێنانەوەشتان پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتێک کە زیندوو بووە شتێکی وتبێت یان ئاکارێکی کردبێت لەگەڵ قورئان و ڕۆحی ئیسلام نەگونجابێت، بۆی ڕاستکراوەتەوە و خوای گەورە پێچەوانەی ئەوەی لێ داوا کردووە، ئەوەش بووەتە مەنهەج بۆمان و ئەگەر فەرموودەیەک سیقات و عەن سیقات بێت، بەڵام موخالەفەی قورئان و ڕۆحی ئیسلام بێت ڕەت دەکرێتەوە هەرچییەک بێت، بۆیە ناتوانرێت بە فەرموودەیەک بوترێت سەحیحە ئەگەر موخالەفەی قورئان بێت، کەوایە دەشێت فەرموودەیەک سەنەدی صەحیح بێت بەس مەتنی موعەلەل و شاز بێت و یەکێک لەو مەرجانەی تێدا نەبێت و زەعیف بێت، بۆیە ئەو دەرگایە دادەخەین و ئەوە قەتعیە لامان ناشێت و ناگونجێت فەرموودەی سەحیح هەبێت و موخالیف بێت بە قورئان.

عەزیز: ئەم قسە مەتاتیانە دەکەن، بەس کە دێتە سەر واقیع هەزاران ئایەت دەچەمێننەوە بۆ فەرموودەیەک.

ماجید: کامە ئایەت چەمێندراوەتەوە لەبەر خاتری فەرموودەیەک؟

عەزیز: چاوەکەم زۆرێک لە زانایانتان دەڵێن: (السُّنَّةُ قَاضِيَةٌ عَلَى الْقُرْآنِ وَلَيْسَ الْقُرْآنُ بِقَاضٍ عَلَى السُّنَّةِ) یان دەڵێن: (القرآن إلى السنة أحوج من السنة إلى القرآن) ئیتر ئێستا بەڵگەیەک دووانم لە یاد نییە پێت بڵێم، بەڵام ئەوە نەشاردراوەتەوە کە ئەوە سوونەیە حاکم و قازییە بەسەر قورئانەوە لاتان و ئەوە قورئانە پێویستی بە سوونەیە، ئەم مەفهومەش لای هەمووتان موسەلەماتە؛ واتە دەکرێت لە پێناو فەرموودەیەک چەندان ئایەت بچەمێننەوە.

ماجید: ئاخر ئیشکالییەکە ئەوە نییە کە هەر قسە بێنیت و من وەڵام بدەمەوە، کێشەکە لەوە دایە تۆ دەڵێیت فەرموودە هەیە و من دەڵێم یەک فەرموودە بهێنە کەچی لێی ڕادەکەیت و وەڵامت بۆی نییە، با وەڵامی ئەم تەوەرەشت بدەمەوە؛ بەهیچ شێوەیەک زڕاندنی دەق و لادانی مەعنای حەقیقی دەق چ سوونە چ قورئان جائیز نییە و تاوانێکی گەورەیە و زۆرجار عاقیبەتەکەی کافر بوونە، ئەمەش هەر لە قورئان وەرگیراوە وەک خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَقُولُوا لِمَا تَصِفُ أَلْسِنَتُكُمُ الْكَذِبَ هَٰذَا حَلَالٌ وَهَٰذَا حَرَامٌ لِّتَفْتَرُوا عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ ۚ إِنَّ الَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ لَا يُفْلِحُونَ﴾[1]، هەر ئەم مەفهومەیە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) و ئەصحاب ڕەنگی داوەتەوە وەک چۆن پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت «ومَن قال في القرآنِ برأيِّهِ، فليتَبوَّأْ مَقعدَهُ مِن النَّارِ» هەروەها ئیمامی ئەبوبەکر دەفەرموێت: (أي سماء تظلني وأي أرض تقلني إذا قلت في كتاب الله ما لا أعلم) بۆ ئەوەی زۆر کاتتان نەگرم بە هێنانەوەی بەڵگە، تەنیا ئەوەندە دەڵێم هەرگیز زانایان دەقێکی قورئانی ناچەمێننەوە لەبەر خاتری فەرموودەیەک یان دووان، وە قاعیدەیەکی تەفسیری دەق هەیە و تەواوی زانایان موتەفیقن لەسەری ئەویش ئەوەیە (الأصل في الكلام الحقيقه) بەڵام کاتێک حەقیقەت هەڵنەگرێت ئەوکات (إذا تعذرت الحقيقة يصار

---

(1) [النحل: ١١٦]

إلى المجاز) بۆیە هەموو ئەمانە خەڵکانێکی عامی دەتوانرێت باوەڕ بکات بەوەی کە تۆ دەیڵێیت، بەس خەڵکە خوێندەوارەکە دەزانێت هەزاران یاسا و ڕێسا دانراوە بۆ تەفسیری کەلیماتی قورئان و داوتریش چەندان زەوابیت و یاسا دانراوە بۆ (جەمع) و (تەوفیق) لەنێوان دوو دژیەکدا، بۆیە لێرەشدا دەڵێین ئەستەمە و ناگونجێت هیچ زانایەکی ئیسلامی ئایەتێکی قورئان بچەمێنێتەوە لەبەر خاتری هەموو بوخاری نەک فەرموودەیەک یان دووان، ئەمە ئەو یاسا و ڕێسایەی خۆیان دایان ناوە قبووڵی ناکات، چ جای ئەوەی سوونە بە ئەهلی دۆزەخ ناویان دەبات و قورئانیش بە کافر ناوزەندیان دەکات، هیوام وایە ئایەتێک بهێندرێتەوە بەو جۆرەی باست کرد، کە دڵنیام تەنیا ئایەتێک نییە بەو جۆرە و هەشبێت ئێمە مولزەمین بەوەی تەفسیرەکە یان فەرموودەکە ڕەت بکەینەوە و ئەوسەقێک وەلا دەنێین لەبەر خاتری ئەوسەقترێک لە خۆی.

عەزیز: بەم جۆرە ناگەینە نەتیجە ئەم شێر و ڕێویەی بۆ مەکە، وەک وتمان هەر ئەوە نییە کە موخالیفی قورئانە، بەڵکوو زۆرجار موخالیفی زانستی تەجروبەکراوی سەردەمە، بۆ نموونە: (لولا بنو اسرائیل لم یخنز اللحم) ئەوەتا گوایە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی ئەگەر بەنی ئیسرائیل نەبوونایە گۆشت نەدەگەنی و خراپ نەدەبوو، بێئاگا لەوەی کە ئەمە عیلم سەلماندوویەتی گەنینی گۆشت ڕەبتی بە دین و بەنی ئیسرایل و شتەوە نییە ئەمە ڤایرۆس و بەکتریایە و دەیگەنێنێت، ئەم فەرموودە سەحیحە چۆن وەڵام دەدەیتەوە؟

ماجید: وەاللّٰە برام ئەو فەرموودە وەڵامدانەوەی زۆر ئاسانە جوابێکت پێ دەڵێم دەشێت نەتبیستبێت، پیاوێکی ڕەزیل ناوی هۆزان بوو ڕەزیلییەکەی دەگەیشتە ئەوەی پارەی هەرگیز خەرج نەدەکرد، ئەو پارانەی کۆدەکردەوە تاوەکوو لە جێیەک خۆرکە لێیدا و زۆرینەی خراپ بوو، برادەرێکمان دێت

دەڵێت هۆزان نەبوایە هەرگیز پارە خۆرکە لێی نەدەدا! جا ئەم نموونەیەش بۆ بەنی ئیسرائیل و ئەو فەرموودەیە هەمانە شتە، بەنی ئیسرائیل یەکەم کەس بوون کە ئەوەیان داهێنا کە گۆشت هەڵبگرن و خەزنی بکەن، بەو گۆشت هەڵگرتنە بوونە خاوەنی سوونەتێک کە بەهۆیەوە گۆشت دەگەنی، بۆیە ئەو فەرموودەیە وەک مانا شتێکی ئاساییە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوەی فەرمووبێت، کێشەکە لەوەدا نییە میعیارێک بۆ وەحی دادەنێن و سوونەی پێ دەپێون کە میعیار و پێوەرێکی هەڵەیە، بۆ نموونە خوای گەورە دەربارەی هاوەڵانی ئەشکەوت دەفەرمووێت: ﴿وَ لَبِثُواْ فِيْ كَهْفِهِمْ ثَلاٰثَ مِائَةٍ سِنِيْنَ وَ ازْدَاْدُواْ تِسْعَاً﴾ باشە وەک زانست و عیلمی تەجریبی ناکرێت و ناگونجێت کەسێک سێسەد ساڵ پاڵبکەوێت و بخەوێت و یان و یان ....، دەی ئەمە لەبەر ئەوەی دژی زانستی تەجریبییە ئیتر بێین بەو ڕێسایەی تۆ کار بکەین و بڵێین ئەمەش دژی زانستە دەبێت وەلابنرێت، خۆ ئێمە ڕێککەوتین هەردووکیان وەحی بن، بۆچی دێیت یاسایەک بۆ فەرموودە دادەنێیت لەکاتێکدا ئەو یاسایە بۆ قورئان بەکارناهێندرێت، سەرەڕای ئەوەش ئەوە یەکێکە لە یاسا و ڕێساکانمان کە ئەگەر فەرموودەیەک خیلافی زانستی تەجروبەکراو بێت، ئەوا ئەو فەرموودەیە عیللەتی تێدایە و نەخۆشە و یەکێک لە مەرجەکانی سەحیح بوونی تێدا نییە و زەعیفە، بۆیە دەشێت ئەمە ڕای گشتی و عاممەی پێ هەڵبخەڵەتێنرێت کە گوایە فەرموودەی سەحیح هەیە موخالیف بێت بە زانست، هەرگیز فەرموودەی سەحیح موخالیف نییە بە زانست و بەڵکوو زۆرجار سەرچاوەی زانستە.

عەزیز: ئەوەتا ئەو فەرموودە دژبەیەکە لەگەڵ واقیع و عیلم تۆ هاتوویت دیفاعی لێدەکەیت، فەرموودەکەت تەزعیف نەکرد، کەچی دەتەوێت بە چەند یاسا و ڕێسایەک لە بابەتەکە ڕابکەیت، بۆیە وەک وتم ئەو فەرموودە بە سەڕیحی موخالیفە لەگەڵ عەقڵ و عیلم و واقیع، چۆن ئەمە وەڵام دەدەیتەوە.

ماجید: ئێ برام وەڵامم دایەوە و نموونەی ئەو پیاوەم باسکرد کە ناوی هۆزان بوو، ئەی نەمانووت کە هۆزان ئەوەندە پارەی خەرج نەکرد و خەزنی کرد هەتاوەکوو خۆرکە لێیدا و دواتر وترا کە ئەگەر هۆزان نەبوایە پارە خۆرکە لێی نەدەدا، ئەمەش هەمانە شتە و هەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەو جۆرە فەرموویەتی.

عەزیز: برام وەاللّٰە ئەوە خۆ دزینەوەیە لە پرسیارەکە! بۆ ئەوەندە جورئەتت نییە بڵێی زەعیفە؟

ماجید: موشکیلەی من و تۆ لەسەر ئەوە نییە کە من بەوە بڵێم زەعیفە یان نا! ئەگەر موشکیلەی ئێمە لەسەر ئەوە بێت، ئەوە وەلای دەنێین، چونکە هیچ تەئسیرێکی نییە لەسەر ئەحکام و عەقیدە و چی و چی، دەتوانین زۆر بە ئاسانی وەک زۆرێک لەو زانایانەی کە ڕەت یان کردووەتەوە، لەوانەش دکتۆر یوسف قەرزاوی، بەڵام من پێم وایە چەند زەعیف بێت مانایەکی جوانی تێدایە و ئەویش زەمکردنی ئیدخار و خەزنکردنە و باسی یەکێکە لە سیفەتەکانی بەنی ئیسرائیل ئەویش دەستبەسەراگرتن و خەزنکردنی ماڵ و سەروەت و سامانە و ئەوەتا تا ئێستاش ئەو سیفەتەیان تێدا ماوە، بۆ زانیاریشت کارپێکردن ئازایەتییە ڕەت کردنەوە کاری تەمەڵ و بوودەڵەکانە و هەموو کەس لێی دەزانێت، بۆیە (جەمع) و (تەوفیق) و (سەرفکردن)ی مەعنا لە حەقیقەتەوە بۆ (مەجاز) دانراوە تا ئێمە بتوانین سوود لە زۆرترین دەق و فەرموودە ببینین.

مەلا موحەممەد: بەڕێزان خەریکە لە بابەتەکە دوور دەکەوینەوە و بابەتانێکی ئوصوڵی باس دەکەین، بۆیە کاکٰ عەزیز تکام وایە پرسیارەکانت بەخێرایی بکەیت و کاتێک وەڵام درایەوە پرسیارێکی تر بکە و تێبینی لەسەر جوابەکانی مەدە، چونکە کاتمان زۆر کەمی ماوە.

## تەوەری شەشەم
## کامیان قورئانی بوون؟

پاش ئەو موناقەشە دوورودرێژە پێم خۆشە بیری خۆم و ئێوەش بێنمەوە کە بزانین کامیان قورئانین؟ ماجید یان ئەوانەی ناونراون قورئانی؟ هەڵبەت ئەوەی کە ڕابورد لە قسەکاندا هیچ یەکێکیان غەیری قورئان نەبوو!، هەر بە ئایەتەکانی قورئان بوو سەلماندیان کە غەیری قورئان وەحیی بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاتووە، هەر بە قورئان بوو سەلماندیان کە ئەو وەحییانەی غەیری قورئان هاتوون مولزیم بوون، هەر بە قورئان سەلماندیان کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) مافی یاسادانان و حوکمی پێدراوە، دواتریش سەلماندیان کە قورئان هەندێک بابەتی بەجێهێشتووە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) حوکمی تێدا بدات، سوونەی کردووەتە حەکەم و داڕێژەر تێیدا، دواتریش سەلماندیان کە سوونە تەفسیر و شارحی قورئانە و ئیتر ئەوان نەهاتن قیاس و ئیجماع و کۆمەڵێک دەلائیلی عەقڵی بەکاربهێنن، کە پێم وایە هەموو ئەوانە تەئیدی ئەو بیرە دەکەن کە سوونە و ئەحادیسی پێغەمبەری خوا (ﷺ) یەکێکن لە سەرچاوەکانی یاسا دانان و واجبە لەسەر موسڵمانان بە گوێی ئەحادیسی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بکەن، وەک چۆن بە گوێی قورئان دەکەن، ڕوونتر بڵێم هەموو قورئانییەکان دەبێت ئاگایان لەوەبێت کە فەهمی خۆیانە و شەرحی خۆیانە بۆ قورئان کە دەڵێن سوونە و فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) دین نین، قسە و ئیستینتاجی خۆی لێ بووە بە دین و قسەی پێغەمبەر (ﷺ) دین نییە! وردتر بڵێین ئەو حەقە دەدات بە خۆی شەرحی قورئان و ئایەتەکانی

ماجید: ئێ برام وەڵامم دایەوە و نموونەی ئەو پیاوەم باسکرد کە ناوی هۆزان بوو، ئەی نەمانووت کە هۆزان ئەوەندە پارەی خەرج نەکرد و خەزنی کرد هەتاوەکوو خۆرکە لێیدا و دواتر وترا کە ئەگەر هۆزان نەبوایە پارە خۆرکە لێی نەدەدا، ئەمەش هەمانە شتە و هەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەو جۆرە فەرموویەتی.

عەزیز: برام وەاللّٰه ئەوە خۆ دزینەوەیە لە پرسیارەکە! بۆ ئەوەندە جورئەتت نییە بڵێی زەعیفە؟

ماجید: موشکیلەی من و تۆ لەسەر ئەوە نییە کە من بەوە بڵێم زەعیفە یان نا! ئەگەر موشکیلەی ئێمە لەسەر ئەوە بێت، ئەوە وەلای دەنێین، چونکە هیچ تەئسیرێکی نییە لەسەر ئەحکام و عەقیدە و چی و چی، دەتوانین زۆر بە ئاسانی وەک زۆرێک لەو زانایانەی کە ڕەت یان کردووەتەوە، لەوانەش دکتۆر یوسف قەرزاوی، بەڵام من پێم وایە چەند زەعیف بێت مانایەکی جوانی تێدایە و ئەویش زەمکردنی ئیدخار و خەزنکردنە و باسی یەکێکە لە سیفەتەکانی بەنی ئیسرائیل ئەویش دەستبەسەراگرتن و خەزنکردنی ماڵ و سەروەت و سامانە و ئەوەتا تا ئێستاش ئەو سیفەتەیان تێدا ماوە، بۆ زانیاریشت کارپێکردن ئازایەتییە ڕەت کردنەوە کاری تەمەڵ و بوودەڵەکانە و هەموو کەس لێی دەزانێت، بۆیە (جەمع) و (تەوفیق) و (سەڕفکردن)ی مەعنا لە حەقیقەتەوە بۆ (مەجاز) دانراوە تا ئێمە بتوانین سوود لە زۆرترین دەق و فەرموودە ببینین.

مەلا موحەممەد: بەڕێزان خەریکە لە بابەتەکە دوور دەکەوینەوە و بابەتانێکی ئوصوڵی باس دەکەین، بۆیە کاک عەزیز تکام وایە پرسیارەکانت بەخێرایی بکەیت و کاتێک وەڵام درایەوە پرسیارێکی تر بکە و تێبینی لەسەر جوابەکانی مەدە، چونکە کاتمان زۆر کەمی ماوە.

## تەوەری شەشەم
## کامیان قورئانی بوون؟

پاش ئەو موناقەشە دوورودرێژە پێم خۆشە بیری خۆم و ئێوەش بێنمەوە کە بزانین کامیان قورئانین؟ ماجید یان ئەوانەی ناونراون قورئانی؟ هەڵبەت ئەوەی کە ڕابورد لە قسەکاندا هیچ یەکێکیان غەیری قورئان نەبوو!، هەر بە ئایەتەکانی قورئان بوو سەلماندیان کە غەیری قورئان وەحیی بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاتووە، هەر بە قورئان بوو سەلماندیان کە ئەو وەحییانەی غەیری قورئان هاتوون مولزیم بوون، هەر بە قورئان سەلماندیان کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) مافی یاسادانان و حوکمی پێدراوە، دواتریش سەلماندیان کە قورئان هەندێک بابەتی بەجێهێشتووە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) حوکمی تێدا بدات، سوونەی کردووەتە حەکەم و داڕێژەر تێیدا، دواتریش سەلماندیان کە سوونە تەفسیر و شارحی قورئانە و ئیتر ئەوان نەهاتن قیاس و ئیجماع و کۆمەڵێک دەلائیلی عەقڵی بەکاربهێنن، کە پێم وایە هەموو ئەوانە تەئیدی ئەو بیرە دەکەن کە سوونە و ئەحادیسی پێغەمبەری خوا (ﷺ) یەکێکن لە سەرچاوەکانی یاسا دانان و واجبە لەسەر موسڵمانان بە گوێی ئەحادیسی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بکەن، وەک چۆن بە گوێی قورئان دەکەن، ڕوونتر بڵێم هەموو قورئانییەکان دەبێت ئاگایان لەوەبێت کە فەهمی خۆیانە و شەرحی خۆیانە بۆ قورئان کە دەڵێن سوونە و فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) دین نین، قسە و ئیستینتاجی خۆی لێ بووە بە دین و قسەی پێغەمبەر (ﷺ) دین نییە! وردتر بڵێین ئەو حەقە دەدات بە خۆی شەرحی قورئان و ئایەتەکانی

قورئان بکات، بەڵام ئەو حەقە ناداتە پێغەمبەری خودا (ﷺ)! ئەوە چ جۆرە هەڵەیەکە ئەو برایانەی تێی کەوتوون، بۆیە تەنیا بەوەندە کۆتایی پێ دێنم کە ئەگەر بمانەوێت قورئانی بین دەبێت باوەڕمان وابێت پێغەمبەری خوا (ﷺ) (واجب الاطاعة)یە و پێویستە لەسەر موسڵمانان ئەگەر بینییان فەرموودەیەکی صەحیح هەیە ئەوە واجبە لەسەریان گوێڕایەڵی بکەن.

ئا لێرەدا چیرۆکەکە تەواو نابێت، بەڵکوو ماجید بەردەوام دەبێت لەسەر وەڵامدانەوەکانی و هیچ دانیشتنێکی گومان و شکێک نامێنێت کە خۆی پێنەگەیەنێت و وەڵامی دانیشتنەکان نەداتەوە و هەرچی نووسین وتار و قسەکانییەتی وەڵامی گومان و قسەی قورئانییەکان دەبێت، تا وای لێدێت زۆرێک لە فێرخوازان و شەیدایانی زانستە شەرعییەکان بۆ ئەو جۆرە پرسیارانە ماجید دەکەنە سەرچاوە و ئیلهامی قسەکانیان. چیرۆکەکەش بەردەوامە و ماجیدیش ناوەستێت...

لەم چیرۆکەدا هەردوو کارەکتەری (ماجید) و (عەزیز) دوو کارەکتەری دروستکراون، بەڵام وێنایان لە کۆمەڵگەی ئێمەدا هەیە، کارەکتەری (ماجید) وەک قورئانییەک دەیەوێت بیسەلمێنێت کە فەرموودەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەحییە و سەرچاوەیەکە لە سەرچاوەکانی یاسا دانان، (عەزیز)یش وەک قورئانییەک دەیەوێت بیسەلمێنێت کە قورئان سەرچاوەی وەحییە و پێوەری ڕاست و دروستی فەرموودەیە و فەرموودەش هیچکات نابێتە سەرچاوەی یاسادانان، ئێمەش وەک خوێنەری ئەم چیرۆکە تەماشا دەکەین بزانین عەزیز قورئانییە یاخود ماجید؟ پێکەوە دەچینە خزمەت چیرۆکەکە.

نرخ : ٢٠٠٠ دینار